


گۆڤارێکی گشتی مانگانەیە

ژمارە (4) یەک شەممە 1/4/2018

# ئایا دەنگ هەڵێنان لە زکری دوای نوێژ ڕێگە پێدراوە ؟

عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی (لاپەرە 6 )

١٦ م.هێمن خورشید

**چەند پەیڤێك دەربارەی قەرمووده**

١٣ میران مجید

**بەسەرهاتێکی شێخی بوتی**

١٠ حسن موفتی

**تیشکێك لەسەر پێگەی زانست و زانایان لە ئیسلامدا**

خاوەنی ئیمتیاز :
- ئەیاد نادر
Ayadqadr10@gmail.com _ 07800932624

بەڕێوەبەری گشتی :
- ئاوارە کاوێس
malaawarakawes@gmail.com _ 07508447484

سەرنووسەر :
- زامدار قادری
Muhammadibrahim9232@gmail.com _ 07507399232

بەڕێوەبەری هونەری :
- ارکان صدیق بەقال
Arkanbaqal1990@gmail.com _ 07503081803

دیزاین :
- بلال برزنجی
bilalbakr.1995@gmail.com _ 07507606006



# ڕەهـــــــا

* ڕەها گۆڤارێکی مانگانەی گشتی یە ، بە شێوازی ئەلیکترۆنی بڵاو دەکرێتەوە .

* ڕەها بابەتی نوسەران بە چەند فلتەرێك دادەبات ، دواتر بڵاو دەکرێتەوە ، ئەگەر بابەت لە ژمارەیەك بڵاو نەکرێتەوە ڕەنگە هەڵبگیرێت بۆ ژمارەکانی داهاتوو .

* ڕەها بە هیچ شێوەیەك بەر پرس نیە لە هیچ یەك لە بۆچوونی نوسەران .

* دەستەی نوسەرانی ڕەها ( د. ابراهیم هەرشەلی ، زامدار قادری ، د. بەدر قادر سورچی ، محمد مەلا سعدالدین ، ئاوارە کاوێس ، نیاز عەزیز )

بۆ هەر ڕەخنە و پێشنیارێك دەتوانن بەم ئیمەیلەی خوارەوە ئاگادارمان بکەنەوە
Govari.raha@gmail.com

دەستەی نووسەران

# فەزل و گەورەیی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت

زنجیرەی (3)



خوای گەورە وەصف و ستایشی زۆرێك لە پێغەمبەرانی کردووە بە زانست بەلام جۆری زانستەکەی دیاری کردووە وەك لە باسی حەزرەتی ئادەمدا دەفەرموێت زانستی ناوی تەواوی شتەکان فێرکراوە ( وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمَاءَ كُلَّهَا ) واتە : ( جا لەبەر ئەوە خودای گەورە ئادەمی هەڵبژاردبوو بۆ جێ نشینی خۆی ناوی هەموو شتە پێویستیەکانی فێر کرد و تێی گەیاند ) ( البقره ٣١ ) وە لە ستایشی حەزرەتی عیسادا دەفەرموێت ( وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَاةَ وَٱلْإِنجِيلَ ) واتە : ( خوای گەورە کتێبی فێر دەکات و هۆی زانیاری و هۆشیاری بۆ ئامادە ئەکات و تەورات و ئینجیلی فێر دەکات ) (ال عمران ٤٨) لەسەر زمانی حەزرەتی یوسف دەفەرموێت زانستی پەرژینی کردنی خەونمان فێرکردووە ( وَقَالَ ٱلَّذِي ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِ أَكْرِمِي مَثْوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا , وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ , وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمْرِهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ) واتە : ( ئەو پیاوە میسرییە کە یوسفی کری عەزیزی میسر بوو ، بە ژنەکەی وت خزمەتی ئەو کزرە بکە و قەدری بگرە هیوام وایە لە بارەگا بە کەلکمان بێت و سوودمان پێ بگەینێ یان با هەر بیکەین بە کوری خۆمان ئا بەو جۆرە جێگە و ڕێگەمان لە ئەرز بۆ یوسف خۆش کرد و ماوەیەکی باشمان بۆ رەخساند تا فێری مەعنای قسەی ورد و خەون لێکدانەوەی بکەین بە ڕاستی خودا بەسەر کاری خۆیدا زاڵە و مەبەستی خۆی جێ بە جێ ئەکات بەڵام بەشی زۆری خەڵك ئەم ڕاستییە نازانن ) ( یوسف ٢١ )

وە حەزرەتی خزر زانستێکی خودای کە فراسەت و بەرچاو ڕوونی بوو (وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا علمًا) واتە : ( شتی وامان فێر کردبوو لە ڕێگای وەحی بۆ کردنی ئێمەوە نەبێ نازانرێ ) (الکهف ٦٥) وە حەزرەتی داود زانستی دروست کردنی تفاقی شەڕ و عتادی ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمنی پێ بەخشرا ( وَعَلَّمْنَٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لكم) واتە ( فێریشمان کرد زرێ و تاس کلاوی جەنگیتان بۆ دروست بکا بۆ ئەوەی لە جەنگا بتانپارێزێ ) (الانبیاو ٨٠) وە حەزرەتی سلێمان بە زانستی زمانی پەلەوەر ەکان ( يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ) واتە : ( ڕووی کردە خەڵکەکەی و وتی خەڵکینە ئێمە لە لایەن خواوە فێری زمانی پەلەوەر بووین ) (النمل ١٦)

قال الفخر الرازي ( إن الله علم سبعة نفر سبعة أشياء ) پێشەوا فەخری رازی دەفەرموێ خودای گەورە حەفت شتی فێری حەفت کەس کردووە

أ- ( وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ) واتە : ( جا لەبەر ئەوە خودای گەورە ئادەمی هەڵبژاردبوو بۆ جێ نشینی خۆی ناوی هەموو شتە پێویستیەکانی فێر کرد و تێی گەیاند ) ( البقره ٣١ )

ب- علم الخضر الفراسة ( حەزرەتی خضری فێری زانستی فیراسەت کرد) : ( وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا علمًا ) واتە : ( شتی وامان فێر کردبوو لە ریگای وەحی بۆ کردنی ئێمەوە نەبێ نازانرێ ) (الكهف ٦٥)

ج- و علم یوسف التغییر( حەزرەتی یوسفی فێری زانستی خەون لێکدانەوە کرد) : ( رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِي مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ) واتە : ( ئەی خودای پەروەردگار بەڕاستی تۆ مولك و دەسەڵاتت پێ بەخشیوم فێری مەعنای کتێب و لێکدانەوەی خەون بینینت کردووم ) ( یوسف ١٠١ )

د- علم داود صنعه الدرع ( حەزرەتی داودی فێری دروستکردنی زرێ کرد ): ( وَعَلَّمْنَٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لكم ) واتە ( فێر یشما ن کرد زرێ و تاس کلا و ی جەنگیتان بۆ دروست بکا بۆ ئەوەی لە جەنگا بتانپارێزێ ) ( الانبياء ٨٠ )

هـ - علم سلیمان منطق الطیر ( حەزرەتی سولەیمانی فێری زانستی پەلەوەر ) : ( يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ) واتە : ( ڕووی کردە خەڵکەکەی و وتی خەڵکینە ئێمە لە لایەن خواوە فێری زمانی پەلەوەر بووین ) ( النمل ١٦ )

و- علم عیسى علیه السلام علم التوراه والإنجیل ( حەزرەتی عیسای فێری زانستی تەورات و ئینجیل کرد ): ( وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ) واتە : ( خوای گەورە کتێبی فێر دەکات و هۆی زانیاری و هۆشیاری بۆ ئامادە ئەکات و تەورات و ئینجیلی فێر دەکات ) ( ال عمران ٤٨ )

بەلام کاتێك باسی حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لێبێ) بە دەستەواژەی گشتگیر (صغه عموم) باسی زانستی پێغه مبه ر (درودی خوای لێبێ) وەك دەفەرموێت ( وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ ، وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا ) واتە : ( خودا قورئان و حیکمەتی بۆ ناردوویت و شتی وای فێر کردوویت لەوەوپێش نەت ئەزانی فەزل و رەحمی خودا لەسەر تۆ زۆر گەورەیە ) ( النساء ١١٣ ) تفسیر الطبری =جامع البیان ط هجر ( 7 / 480 )

وەك زانی تەفسیرزان پێشەوا تەبەری لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەفەرموویت ( وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُنْ تَعْلَمُ ) واتە : (شتی وای فێر کردوویت لەوەوپێش نەت ئەزانی ) ( النساء: 113 ) ( مِنْ خَبَرِ ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْآخَرِينَ , وَمَا كَانَ , وَمَا هُوَ كَائِنٌ قَبْلَ , ذَٰلِكَ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ عَلَيْكَ )واتە: ( لە باشترین شتی پێشینان و پاشینان، ئەوەی بووە، ئەوەی دواتریش ڕوو دەدا، ئەوەش فەزڵ و چاکەی خوایە لەسەرت ) وە زانستی ئادەم بووە هۆکاری سجدە بردنی فریشتەکان بۆی و زانستی حەزرەتی خزر سەبەب بوو کە حەزرەت موسا و حەزرەتی شوعەیب ببنە قوتابی و شوێنی بکەون ، وە زانستەکەی حەزرەتی داود هۆکار بوو بۆ ئەوەی خوای پەروەردگار لەگەڵ پێغەمبەرایەتیدا حوکم و دەسەڵاتیشی پێ ببەخشێت ، وە حەزرەتی سلێمانیش بە هۆی زمانی پەلەوەرانەوە توانی زاڵ بێت بەسەر مەملەکەتی بەلقیسدا و بە باوەڕەوە شوێنی حەزرەتی سلێمان بکەوێت ، وە حەزرەتی عیسا بەهۆی زانستەکەیەوە توانی هەموو تۆمەتێکی خراپ لە دایکی دوور بخاتەوە ، وە پێغەمبەریشمان محمد (درودی خوای لێبێ) بە هۆی زانستەکەیەوە خوای پەروەردگار شەفاعەتی گەورەی پێ بەخشیووە کردوویەتی بە خاوەنی مەقامی محمود ، وە تەواوی پێغەمبەران لە ژێر ئاڵاکەیدا کۆ دەبنەوە .



د.ابراهیم هەرشەلی

# ئایا دەنگ هەڵێنان لە زکری دوای نوێژ ڕێگە پێدراوە ؟



**بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ**
**اَلْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ وَالصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ عَلَي سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ.**

به داخەوە: لەم سەردەمەی ئێستادا –هەروەك وەزعی كوردستان تێك چووە- وەزعی مزگەوتەكانیش تێك چووەو شێواوە!؟: لە هەندێك مزگەوتدا زیكرەكانی دوای نوێژەكان ناكرێن‌و ئەو سوننەتەی سەردەمی پێغەمبەر مراندراوە، بەڵكو بە (بدعة) ش ناو دەبرێ!؟ هۆی ئەو دیاردە ناشیرنەش ئەمەیە:
-1هەندێك لەو كەسانەی لە مزگەوتەكاندا پێشنوێژی دەكەن، شارەزای شەریعەتی ئیسلام نین‌و بە چاولێكەری ئەو دیاردەیە ئەنجام ئەدەن، هەروەك بەخۆم لە مەلای مزگەوتێكم پرسی: بۆ زیكری دوای نوێژ ناكەی؟ لە وەڵامدا گوتی: ئێستا بووەتە مۆدێل لە دوای نوێژەكان زیكر ناكرێ!.
-2هەندێكی تریش: سەر بەلایەنێكی (بدعة) كارن‌و كاروپیشەیان تێكدانی ڕیزی موسوڵمانانە، دەسەڵاتی (علمانی) ش پشتگیرییان دەكا، بۆیێ هەندێك لەو جۆرە پێشنوێژ و وتارخوێنانە خەڵكی مەنع دەكەن كە لە مزگەوتەكاندا زیكری دوای نوێژەكان بكەن!. ئەوانەش زالمن‌و لە هەموو زالمێك زالمترن؟ چونكە هەڕەشەی ئەم ئایەتە ئەیانگرێتەوە كە خوای گەورە دەفەرموێ [**وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ مَنَعَ مَسَاجِدَ اللهِ أَنْ يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ وَسَعَي فِي خَرَابِهَا**]البقره ( 114 ) ، كێ لەو كەسە زالمترە كە مەنعی مزگەوتەكانی خوا دەكا لەوەی كە زیكری خوایان تێدا بكرێ‌و هەوڵ ئەدا بۆ وێرانكردنیان. واتە: هیچ كەسێك لەو جۆرە كەسە زالمتر نیە. مزگەوتیش ئەگەر زیكری خوای تێدا نەكرێ، وەك مزگەوتێكی وێرانبووە؟ چونكە لەبارەی مزگەوتەكان پێغەمبەر فەرموویەت [ **إِنَّمَا هِيَ لِذِكْرِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ وَالصَّلاَةِ وَقِرَاءَةِ الْقُرْآنِ** ] ( رواه مسلم) ، مزگەوتەكان تەنها بۆ زیكری خوا و نوێژكردن‌و خوێندنی قوڕئانن. جا لەبەر ئەو هۆیانەی ڕابردوو، بە پێویستم زانی: لەبارەی زیكرەكانی دوای نوێژەكان، ئەم نامیلكەیە بنووسم‌و بیسەلمێنم: زیكر لە دوای نوێژەكان هەیە و سوننەتێكی پێغەمبەرەj و هەم ئەو زیكرانە لە سەردەمی پێغەمبەرداj بە دەنگ هەڵێنان بووە.

-[بەڵگەی زیكری دوای نوێژەكان] لەبارەی نوێژی كاتی ترس، خوای گەورە دەفەرموێ: [**فَإِذَا قَضَيْتُمُ الصَّلاَةَ فَاذْكُرُوا اللهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَي جُنُوبِكُمْ**] ( النساء : 103) جا هەر كاتێك نوێژتان كرد، زیكری خوا بكەن بە پێوە بن، بە دانیشتنەوە بن، لە سەر تەنیشتەكانتان بن. مەبەست ئەمەیە: لە كاتی ترسیشدا خوای گەورە فەرمانی بە زیكری دوای نوێژ كردوە، كەوابوو: لە كاتی هێمنی‌و دڵنیاییدا پێویستە زیاتر بایەخ بە زیكری دوای نوێژەكان بدرێ. هەروەها لە كتێبەكانی حەدیس هیچ كتێبێك نیە باسی زیكری دوای نوێژەكانی نەكردبێ، هەر یەكەیان بە ڕیوایەتی جۆراوجۆر باسی زیكرەكانیان كردوە، جا ئێمە دەچینە خزمەت {صحیحی البخاری و مسلم} تا بزانین چۆن ناونیشانیان داناوە بۆ زیكری دوای نوێژەكان: لە (صحیح البخاری)دا ئیمامی (البخاری) ئەفەرموێ: : {**بَابُ الذِّكْرِ بَعْدَ الصَّلاَةِ**} واتە: ئەوە باسی ئەوەیە كە زیكركردن لە دوای نوێژەكان چۆن دەكرێ‌و لە سەردەمی پێغەمبەرداj چۆن بووە. هەم لە (صحیح مسلم) دا هەمان ناونیشان داندراوەو دەفەرموێ: {**بَابُ الذِّكْرِ بَعْدَ الصَّلاَةِ**} .

كەواتە: ناونیشانی (البخاری) و (مسلم) جیاوازییان نیە. جا گوتم: ئەو زیكرانەی دوای نوێژ، لە هەموو كتێبەكانی حەدیسدا هەنە. كەوابوو: پێویست ناكا لێرەدا هەموویان باس بكەم، چونكە ئەوەندە مەشهورن وای لێهاتووە منداڵانیش دەیانزانن. بەڵام ئەوەی زۆر گرنگە كە تەئكیدی لە سەر كراێتەوە: ئەو {33 (**سُبْحَانَ اللهِ**) و 33(**اَلْحَمْدُ لِلَّهِ**) و 33 (**اَللهُ أَكْبَر**)}

ەیە کە لە (صحیحی البخاری ومسلم) دا هاتون، جا من عیبارەتی (صحیح مسلم) دەهێنم [عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِj: مَنْ سَبَّحَ اللَّهَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاةٍ ثَلاثًا وَثَلاثِينَ وَحَمِدَ اللَّهَ ثَلاثًا وَثَلاثِينَ وَكَبَّرَ اللَّهَ ثَلاثًا وَثَلاثِينَ فَتِلْكَ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ، وَقَالَ تَمَامَ الْمِائَةِ لا إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَي كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. غُفِرَتْ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ] رواه البخاري ومسلم واللفظ لە رواە البخاری ومسلم ، پێغەمبەر فەرمویەتی: هەر کەسێك لە دوای هەموو نوێژێك 33 جار بڵێ: (سبحان الله)، 33 جار بڵێ: (الحمدلله)، 33 جار بڵێ: (الله أكبر)، ئەوە دەکاتە (99) بە ژمارەی ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە-کە (أسماءُ اللّٰهِ الْحُسْنَي) یە- جا بۆ تەواوکردنی ژمارەی سەد، جارێك بڵێ: (لَا إِلٰهَ إِلاّ اللّٰهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ, لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَيكُلِّ شَيْءٍ قَدِير) . ئەوە خوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش دەبێ هەرچەند وەك کەفی دەریاش بن.



جا ئەو فەرموودەیەمان بەسە بۆ ئەوەی بڵێین: زیکری دوای نوێژ لە (البخاری)و (مسلم) دا هەیە. زۆر زیکری تریش هەنە، لە بەر درێژی نەمنووسین.

[ چۆنیەتی ژماردنی ئەو زیکرانە ]

[عَنْ يُسَيْرَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها: أَنَّ النَّبِيَّj أَمَرَهُنَّ أَنْ يُرَاعِينَ بِالتَّكْبِيرِ وَالتَّقْدِيسِ وَالتَّهْلِيلِ وَأَنْ يَعْقِدْنَ بِالأَنَامِلِ، فَإِنَّهُنَّ مَسْئُولاتٌ مُسْتَنْطَقَاتٌ] رواه أصحاب السنن بسند صالح، پێغەمبەر فەرمانی پێکردین: لە ژمارەی زیکرەکان ئاگادار بین و بە سەرە جومگەی پەنجەکانمان بیانژمێرین، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا دەهێندرێنە گوفتار و پرسیاریان لێدەکرێن. [وَعَن عَبدِاللّٰه بن عَمْرو رَضِي اللّٰهُ عَنْهُما: رَأَيْتُ النَّبِيَّj يَعْقِدُ التَّسْبِيحَ بِيَمِينِهِ] رواه أصحاب السنن بسند حسن، پێغەمبەرم دیت بە پەنجەکانی دەستی ڕاستەی تەسبیحاتی دەژمارد. [وَعَنْ سَعْدِ بن أَبِي وَقَّاص أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ عَلَي اَمْرَأَةٍ وَبَيْنَ يَدَيْهَا نَوًي أَوْ حَصًي تُسَبِّحُ بِهِ... الْحَدِيثَ]حديث حسن رواه أصحاب السنن، لەگەڵ پێغەمبەر چوینە لای ئافرەتێك، ئافرەتەکە هەندێك ناوکە قەسپ، یان وردە بەردی لە بەردەستدا بون تەسبیحاتی پێدەکردن، واتە: تەسبیحاتی پێ دەژماردن. لە شەرحی حەدیسەکە لە (عَوْن الْمَعْبُود) دا فەرمویەتی: : (وَالْحَدِيثُ دَلِيلٌ عَلَي جَوازِ عَدِّ التَّسْبِيح بِالنَّوَي وَالْحَصَي وَكَذا بِالسُّبْحَةِ لِعَدَمِ الْفَارِقِ لِتَقْرِيرِهِj لِلْمَرْأَةِ عَلَي ذَٰلِكَ وَعَدَمِ إِنْكَارِه) حەدیسەکە بەڵگەیە: لە سەر ئەوەی دروستە تەسبیحات بژمێردرێ بە ناوکە قەسپو وردە بەرد و هەروەهاش بە تەزبێح، چونکە جیاوازی لە نێوان ئەو سێیانەدا نیە، چونکە پێغەمبەر ئافرەتەکەی لە سەر ئەو جۆرە ژماردنە جێگیر کردوە و ڕەخنەی لێنەگرتوە. (عون المعبود شرح سنن أبی داود -باب التسبیح بالحصی- ب(3) ل(428).

2-[ دەنگ هەڵێنان بە زیکرەکانی دوای نوێژ ]

بێینە سەر بەشی دووەم: کە ئەو زیکرانە لە سەردەمی پێغەمبەردا بە دەنگ هەڵێنان بووە: [عَنْ ابْن عَبَّاس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَفْعَ الصَّوْتِ بِالذِّكْرِ حِينَ يَنْصَرِفُ النَّاسُ مِنَ الْمَكْتُوبَةِ كَانَ عَلَي عَهْدِ النَّبِيِّj، وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: كُنْتُ أَعْلَمُ إِذَا انْصَرَفُوا بِذَلِكَ إِذَا سَمِعْتُهُ] وفي رواية: [كُنْتُ أَعْرِفُ إِنْقِضاءَ صلاةِ النَّبِيِّj بِالتَّكْبِيرِ] رواه البخاري ومسلم، (ابن عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فەرمووی: دەنگ هەڵێنان بەو زیکرانەی دوای نوێژ، لە سەردەمی پێغەمبەردا j هەبوو، من بەو دەنگ هەڵێنانە-کە گوێم لێدەبو- دەمزانی نوێژ تەواو بووە، هەم بەگوێلێبوونی (الله أكبر) دەمزانی نوێژی پێغەمبەرj تەواو بووە. واتە: مەبەستی سیوسێ (اللهأكبر)ەکەیە. ئیمام (الحافظ ابن حجر العسقلانی) لە شەرحی ئەم حەدیسەی (ابن عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فەرمویەتی: (وَفِيهِ دَلِيلٌ عَلَي جَوازِ الْجَهْرِ بِالذِّكْرِ عَقِبَ الصَّلاةِ) لەو حەدیسەدا بەڵگە هەیە لە سەر ئەوەی دروستە: لە دوای نوێژ زیکر بە دەنگ هەڵێنان بکرێ... ئینجا فەرمویەتی: (وَاخْتُلِفَ فِي كَوْنِ اِبْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ ذَلِكَ، فَقَالَ عِيَاض: الظَّاهِرُ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ يَحْضُرُ الْجَمَاعَةَ لِأَنَّهُ كَانَ صَغِيرًا مِمَّنْ لا يُوَاظِبُ عَلَي ذَلِكَ، وَلا يُلْزَمُ بِهِ، فَكَانَ يَعْرِفُ اِنْقِضَاء الصَّلاة بِمَا ذُكِرَ. وَقَالَ غَيْرُهُ: يَحْتَمِل أَنْ يَكُون حَاضِرًا فِي أَوَاخِر الصُّفُوف فَكَانَ لا يَعْرِف اِنْقِضَاءَهَا بِالتَّسْلِيمِ، وَإِنَّمَا كَانَ يَعْرِفهُ بِالتَّكْبِيرِ)،واتە: کە (ابن عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ئەوهای فەرمووە، دوو مانای جیاوازی لێدراوەتەوە، یەکەمیان:

(عِيَاض) فەرمويەتی: وا دیارە (ابن عباس) ئامادەی نوێژی بە جەماعەت نەدەبو؟ چونکە منداڵ بوو و تەکلیفی لێنەدەکرا بەردەوام بێتە جەماعەت-ئەو تەکلیفەی لە پیاوان دەکرێ لە منداڵان ناکرێ-، جا ئەو لە دەرەوە بە گوێ لێبوونی زیکری دوای نوێژ دەیزانی نوێژ تەواو بووە. دووەمیان: جگە لە (عِيَاض)ش فەرمويەتی: دەگونجێ (ابن عباس) لە دواوەی ڕیزەکان ئامادەی جەماعەت بوبێ‌و بە سەلامدانەوە نەیدەزانی نوێژ تەواو بووە، بەڵکو بە زیکری (الله أكبر) دەیزانی. (فتح الباری شرح صحیح البخاری)- ب(**2**) ل(**420**و**421**).

برای موسوڵمان: بە بەڵگەی فەرموودەکانی (البخاری)و (مسلم) بۆت ئاشکرا بوو: دەنگ هەڵێنان بە زیکرەکانی دوای نوێژ، دروستە و لە سەردەمی پێغەمبەردا**ا**هەبووە. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە، ئەمەیە: کەسانێکی نەشارەزا و بێ‌ئاگا دەڵێن: دەنگ هەڵێنان بە زیکرەکانی دوای نوێژ، (بدعة) یە. ئەوەش بووەتە هۆی ئەوەی لە زۆربەی مزگەوتەکاندا زیکری دوای نوێژەکان ناکرێ، جا کاتێ ئەو بەڵگانەیان بۆ دێنیەوە، لە وەڵامدا دەڵێن: (پێغەمبەر تەنها ماوەیەکی کەم دەنگی هەڵێناوە تا (صحابة) لێی فێر بون، ئینجا چیتر دەنگی هەڵنەهێناوە). ئەم وەڵامە هیچ بنەمایەکی ڕاستی نیەو لە هیچ حەدیسێکدا بە ئاشکرایی نەگوتراوە: پێغەمبەر دەنگ هەڵێنانی واز لێهێناوە. بەڵکو ئەوان لە بۆچوونێکی ئیمامی (الشافعی)دا رحمەالله تعالی بەهەڵەدا چوینە کە لە شەرحی حەدیسەکەی (ابن عباس)دا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فەرمویەتی: (**فَأَخْتَارُ لِلإِمَامِ وَالْمَأْمُومِ أَنْ يَذْكُرا اللَّهَ تَعَالَي بَعْدَ الْفَرَاغِ مِنَ الصَّلَاةِ وَيُخْفِيَانِ ذَلِكَ، إلاَّ أَنْ يَكُونَ إمَامًا يُرِيدُ أَنْ يُتَعَلَّمَ مِنْهُ فَيَجْهَرُ حَتَّي يَعْلَمَ أَنَّهُ قَدْ تُعُلِّمَ مِنْهُ ثُمَّ يُسِرُّ، وَحُمِلَ الْحَدِيثُ عَلَي هَذا**) بۆ ئیمامو بۆ مەئموم وەها هەڵدەبژێرم: ئەو زیکرانەی دوای نوێژ بە نهێنی بکەن، تەنها ئەگەر ئیمامی نوێژ بیەوێ مەئموومەکان لێی فێر ببن، هەر ئەوندە دەنگ هەڵدێنێ: تا دەزانێ لێی فێر بوینە، ئینجا دەنگی نزم دەکاتەوە، حەدیسەکە هێندراوەتە سەر ئەو مەبەستە. (شرح صحیح مسلم للإمام النووی) -ب(**2**) ل(**360**).

بەهەڵەدا نەچی‌و واتێنەگەی مەبەستی ئیمامی (الشافعی) ئەوەیە: زیکری دوای نوێژەکان فێری مەئموومەکان بکرێ‌و ئینجا بە یەکجاری هەتاهەتایی دەنگ هەڵێنان وازی لێبهێندرێ؟ چونکە ئیمامی (الشافعی) زانایەکی هەشیارە و زۆر چاك دەزانێ: ئەمڕۆ کەسانێك دێنە مزگەوت کە دوێنێ نەهاتبون، سبەینێش کەسانێك دێن کە ئەمڕۆ نەهاتون...بەم جۆرە ڕۆژانە کەسانێك دێنە مزگەوت کە پێشتر نەهاتون‌و فێری زیکری دوای نوێژ نەبوینە. بەڵکو مەبەستی ئیمامی (الشافعی) ئەمەیە: تەنها یەك جار ئیمام بە دەنگ دەڵێ: (سبحان الله)، یەك جار دەڵێ: (الحمد لله)، یەك جار دەڵێ: (الله أكبر)، ئینجا مەئموومەکانیش بە نهێنی هەر زیکرێك لەوانە سی‌و سێ جار دەڵێن. ئەوە ماوەی (**1200**) هەزارودووسەد ساڵە لە کوردستاندا بەو شێوەیەی گوتمان -بەگوێرەی تێگەیشتنی ئیمامی (الشافعی) لە حەدیسەکەی (ابن عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا - زیکری دوای نوێژەکان دەکرێ، ئاشکرایە: موسوڵمانانی کوردستان هەموویان لە سەر مەزهەبی ئیمامی (الشافعی)ن‌و زانایانی ڕابردووش لە فەریکە خوێندەوارانی ئەم سەردەمە تێگەیشتووتر و شەرعزانتر بون‌و زیاتر شارەزای مەزهەبی ئیمامی (الشافعی) بون، والله أعلم.

پرسیار: لە حەدیسەکەی غەزای (خيبر)دا (صحابة) بە زیکری (الله أكبر) و (لاإله إلاالله) دەنگیان هەڵێنا، جا پێغەمبەر دەنگ هەڵێنانەکەی بە ناپەسند دانا و فەرموی: (**يَا أَيُّهَا النَّاسُ ارْبَعُوا عَلَي أَنْفُسِكُمْ فَإِنَّكُمْ لا تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلا غَائِبًا إنَّهُ مَعَكُمْ إنَّهُ سَمِيعٌ قَرِيبٌ تَبَارَكَ اسْمُهُ وَتَعَالَي جَدُّهُ**) رواه البخاری ومسلم، ئەی خەڵکینە هێمن بن، ئێوە هاوار ناکەنە کەڕ و نائامادە، خودا لەگەڵ ئێوەدایە بیسەر و نزیکە.

وەڵام: ئەم ناپەسندیە تایبەتە بە جەنگ، نەوەك شوێنی جەنگاوەرانی ئیسلام بۆ دوژمنی ئیسلام ئاشکرا ببێ، هەروەك ئیمام (الحافظ العسقلانی) لە شەرحی حەدیسەکەدا فەرمویەتی: ((**وَتَصَرُّفُ الْبُخَارِيّ يَقْتَضِي أَنَّ ذَلِكَ خَاصٌّ بِالتَّكْبِيرِ عِنْدَ الْقِتَالِ، وَأَمَّا رَفْعُ الصَّوْتِ فِي غَيْرِهِ فَقَدْ تَقَدَّمَ فِي كِتَابِ الصَّلَاةِ حَدِيثُ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رَفْعَ الصَّوْتِ بِالذِّكْرِ كَانَ عَلَي الْعَهْدِ النَّبَوِيّ إِذَا انْصَرَفُوا مِنَ الْمَكْتُوبَةِ**) دەسکاریی (البخاری) -کە ئەم حەدیسەی لە باسی (جهاد)دا هێناوە- وا ئەخوازێ: ئەو ناپەسندیە تایبەتە بە (الله أكبر) لە کاتی جەنگدا، بەڵام دەنگ هەڵێنان جگە لە جەنگدا، لە حەدیسەکەی(ابن عباس) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ڕابرا: کە دەنگ هەڵێنان بە زیکر لە سەردەمی پێغەمبەردا هەبوو لەو کاتەی نوێژی واجبیان تەواو دەکرد. (فتح الباری شرح البخاری) - ب(**6**) ل(**163**).

**وَصَلَّي اللَّهُ وَسَلَّمَ عَلي سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِه أَجْمَعِين وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمين وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ اِلاّ بِاللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيم.**



**م.عبدالله هەرتەلی**



# لە گوڵستانی عاریفانەوە

## ڕووەو ڕووی دەرگای چوارەم بووین کە ئەویش دەرگای ( تەقوا ) یە ، تەقەی دەرگامان دا و چوینە ژوور .




پەروەردگار دەربارەی مرۆڤەکان ئەفەرمووێ ( إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ) الحجرات ١٣ . واتا : بەڕێزترینتان لەلای پەروەردگار ئەوانەن کە بەتەقواترینن . عاریفان و گەورەکانمان وەها پێناسەی تەقوایان کردوە کە " خۆ پاراستن لە سزا و تورەبونی پەروەردگار بە هەوڵدان و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی ئەو ، لە هەمان کات خۆ پاراستن لەو شتانەی کە پەروەردگار حەرامی کردوون " بە ساناتر بڵێین تەقوا واتا ترسان لە ڕەنجاندنی پەروەردگار . خۆشەویستمان ( صل الله عليه وسلم ) لە حەجیماڵئاوایی لەزمانی شیرینیەوە فەرمووی : ( ئەی خەڵکینە ، تەقوای خودا بکەن ) الترمزی . بە دڵنیایەوە تەقوا گەنجینەیەکی پر لە خۆشی یە ، بوخچەیەکی هەمیشە پڕ لە دیاریە و تیایدا ڕازی بوونی ئیلاهی تیایەتی ، کلیلێکی ئەفسوناوی وایە دەرگاکانی خێر بە ڕوومان دەکاتەوە و بوراقی ڕێگای پر لە خۆشی بەهەشتە . لەبەر ئەم پێگە نایابەیەتی کە لە فەرمایشتەکانیی قورئانی شیرین ١٥٠ جار دەبێت بە چەپکی ڕوناکی و دەڕژێتە دەماغی روحمانەوە . ئەحمەدی کوڕی عاسم دەیگوت : گوێم لە " سەهلی کوڕی عەبدولا " بوو دەیگوت : تەنها خودا یارمەتیدەرە ، و تەنها پێغەمبەر ( صل الله عليه وسلم ) ڕێنیشاندەرە و تەنها تەقوا تێشوو و زەخیرەیە ، هەموو کارێك ئارامگرتن لەسەری پێویستە . ئەوەتا عاریفی گەورە " نەسرابادی " دەڵێت : هەر کەس پەیوەست بێت بە تەقواوە ، تامەزرۆیی بۆ جیابونەوە لە دونیا بۆ دروست دەبێت ، چونکە خودا دەفەرمووێ ( وَلَلدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ، أَفَلَا تَعْقِلُونَ ) الانعام ٣٢ . لە هەمان کات" تەقوا "دابەش دەکرێت بۆ دوو لایەن ، کە ئەمانەیش بریتین لە " ڕووکەش زاهیر " و " ناوەوە باتن " کە هەردووکیان تەقوای خۆیان دەوێت . زنونی مسری دەیگوت: تەقواکەر پێویستە وابکات دەرەوەی بە گوناهـ پیس نەکات و ناوەوەی بە نەخۆشی گرفتار نەکات و هەمیشە لەگەڵ خودادا تەبا بێت . ئیبن عەتا دەڵێت : تەقوای دەرەوە بریتیە لە پارێزگاری کردن لە سنورەکانی پەروەردگار ، تەقوای ناوەوە : بریتیە لە نیەت و ئیخلاس . "تەقوا "هەموو ژیانت ئەگۆڕێت کاتێ وەچنگ دڵێك ئەکەوێت ، لە بچوکترین خراپە ئیدی ئەکەوێتە ململانێ لەگەڵ نەفسدا و خەتاباری دەکا ئەوەتا " واسیتی " دەڵێت : تەقواکار وەکو " ئیبن سیرین "ە ، چل فەردە گونجی کڕی ، منداڵەکەی مشکێکی لە یەکێك لە فەردەکان دەرهێنا ، ئەویش پرسیاری لە منداڵەکەی کرد : لە کام فەردە دەرتهێنا ؟ منداڵەکە گوتی : نازانم . ئیبن سیرین هەڵسا هەموو فەردەکانی هەڵڕژاندە سەر زەوی . هەروەها سوڵتانی عاریفان " بایەزیدی بوستامی " لە هەمەدانە پارچە بەڕێکی بە تەرازوو کڕی ، و گەڕایەوە بوستام و کاتێ کردیەوە دوو مێرولەی تێدا بینی ، لەوێوە گەڕایەوە هەمەدان و دوو مێرولەکەی کێشا نەوەك زیادەی کەوتبێتە سەر و لە جێگاکەی خۆی دوو مێرولەکەشی دانایەوە . بەڵێ " تەقوا " دڵ و رۆح دەبەستێتەوە بە هەستیاری بەرامبەر شتە گومان لێ کراوەکان ، لۆمەی کارە خراپەکانت ئەوەندە ئەکات تا وای لێدێت لە شەرما خەریکە ئەمانەتی رۆح ئەبەخشیەوە مەلەکولمەوت ، کۆمەڵێك لە موریدان " عوتبەی غولام "یان بینی لە شوێنێك ، وەرزی زستان بوو بەڵام ئەرەق هەموو لەشی داگیر کردبوو ، لێیان پرسی : ئەوە بۆ ئاوات لێ هاتوە ؟ گوتی : ئەمە ئەو شوێنەیە بەر لە چەندین ساڵ ئە لێرە گوناهێکم کردوە و ئێستا بیرم کەوتەوە کە تێپەڕ بووم بێرەدا . عاریفان " تەقوا "یان کردۆتە ملوانکەیەك و بە ملی خۆیانیان هەڵواسیوە ، هەر کات بیری گوناهـ ڕویان تێبکا ئەوا ملوانکەکە دەردەهێنن و بە تەقواوە بەرەنگاری دەبنەوە ، وەکو کۆمەڵێك لە عاریفان فەرموویانە : کاتێ دڵەکان تەقوای تێدا بەند بوو شەیتان هەرگیز ناتوانێت بکەوێتە نێوان دڵ و ئەقڵەوە ، هێرشی نەفس بە زیکری " یا حەی " " یا حەی " لە دڵەکانەوە دەردەچن و جەرگ و خوێنی هەوەس و ئارەزوو دەبڕن . وا لێرەدا دەرگای چوارەمان لەدواوە جێهێشت و زانیمان " تەقوا " ئەو شمشێرە نەبەردەیە بەرووی نەفس دا ، دەستی عاریفانمان بەرنەداوە و وا بوینەتە هاودەمیان . ئیدی هەر ماوە بڵێین تەقواتان بە دڵ ، زیکرتان بە دەم ، رۆحتان ئاسودە .



زامدار قادری

# تیشکێك لە سەر پێگەی زانست و زانایان لە ئیسلامدا



حەمد و ستایشی بۆ پەروەردگار، درودو رەحمەتی خودا لە سەر گیانی پاكی حەزرەتی محمد و گشت یار و یاوەرانی بە گشتی تا رۆژی دوایی .. ئاشكرایە ئاینی پیرۆزی ئیسلام ناسراوە بە ئاینی خۆشەویستنی زانست و گرنگی دانی بە زانایان. لەبەر ئەوە هەرگیز لە نێوان زانایانی تێگەیشتو و پێگەیشتو دا لەلایەك و دەقەكانی شەریعەتی ئیسلام لە لایەكی تر دژایەتی و بەرهەڵستكاری پەیدا نەبووە ئیمامی شافعی ئەفەرمووێت :

فقيهاً وصوفياً فكن ليسَ واحدا ً فَإني وَحَقِّ اللَّهِ إيَّاكَ أَنْصَحُ

فذلك قاسٍ، لم يذق قلبه تقي وهذا جهولٌ، كيف ذو الجهل يصلحُ؟

بە پێچەوانەی هەندێ ئاینی دی بە تایبەت یەهودییەت و نەسرانیەت . بۆیە هەر لە یەكەم ئایەتی پیرۆزی قورئاندا خودای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرەكەی ( صلى الله عليه وسلم) كردووە بەوەی كە بخوێنێت و لە ناوی خوداوە بنوارێتە جیهانی فراوانی زانست وزانیاری، هەروەها فەرمان بدات بە ئومەتەكەی كە ئاوێتەی زانست ببن وخۆیان بەهرەمەند بكەن لەچەمكە پڕ بایەخەكانی مەعریفەت كە بە خوێندن و خوێندنەوە هەنگاو دەنێت وەك دەفەرمویت:(( ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ)) (سورةتي العلق 1)شایەنی باسە لەو ئایەتە پیرۆزەوە جگە لە گرینگیدان بە زانست ئەوەیشمان بۆ روون دەبێتەوە كە زانستێك جێگەی بایەخە كە مرۆڤ بگەیێنێتە یەكتاپەرستی و خوداناسی، هەروەك چۆن عەقڵێك بە سودە كە خاوەنەكەی. لە ئاگری دۆزەخ بپارێزێت و گوێڕایەڵی بۆ فەرمانەكانی خودا و پێغەمبەری خودا ( صلى الله عليه وسلم) پەیدا بكات، وەك لە چەمكی دژە واتای ئایەتی پیرۆزی: (( وَقَالُواْ لَوۡ كُنَّا نَسۡمَعُ أَوۡ نَعۡقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ)) ( سورةتي الملك:10) روون دەبێتەوە كەواتە گەورەترین زانست ئەو زانستەیە كە مرۆڤ لەو حەقیقەتە ئاشنا دەكات كە ئەو هەموو بونەوەر دروستكراوی پەروەردگاریەتی وپێویستە لەسەری بە تەنها و تەنها ئەو خودایە (جل جلاله) بپەرستێت. لایەكی تری ئایەتەكەی سورەتی عەلەق ئەوەمان بۆ روون دەكاتەوە كە سەرچاوەی یەكەمی هەموو زانین و زانست ومەعریفەتێكی بە سود خودی خوایە.. هەروەها ئەو حەقیقەتەش بەر جەستە دەكات كە مرۆڤ هەرچەندە زانیار بێت هەر لە بەرانبەر زانست وزانیاری پەروەردگاریدا(جل جلاله) هیچی نەزانیوە. بۆیە گرنگە مرۆڤەكان هەرگیز مەغرور سەركەش نەبن بەو كەمە زانستەی كە هەیانەو خودا پێی داون، وە بشزانن كە بەردەوام لە سەرو ئەوانەوە زانا وزانیاری تر هەیە (( وَفَوۡقَ كُلِّ ذِي عِلۡمٍ عَلِيمٞ)) ( سورةتي يوسف: 76). هەتا دەگاتەوە زاتی ئەقدەس(جل جلاله) كە ئیتر سەرچاوەی هەموو زانستەكانەو لە سەرو ئەوەوە زانیارێكی دی نییە بەلام وەك زانایانی فە رمویانە ئەو ئەداتی هەمەگیرە كە لە ( كل ) دا بەرجەستە بووە خودی پەروەردگار ناگرێتەوە، هەروەك ئایەتی پیرۆزی: ( وَخَلَقَ كُلَّ شَيۡءٖ فَقَدَّرَهُۥ تَقۡدِيرٗا) (سوره الفرقان: 2) (كل شی) خۆدی خۆی ناگرێتەوە، چونكە مەبەستی لەو جۆرە ئایەتانەدا تە نها دروستكراوەكان



پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە زانكۆی صلاح الدین/ هەولێر
ئەندامی لێژنەی باڵای فەتوا لە كوردستان



حسن موفتی

# لە نوێگەریەکانی پەیامەکانی نوور :

# ژیان لە سایەی ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە



یەکێك لەو بابەتانەی کە گرنگیەکی زۆری پێدراوە لە پەیامەکانی نووردا و پانتاییەکی فراوانی گرتووە ، بریتیە لە ژیان لەخزمەت ناوو سیفەتە پیرۆزەکانی خودای گەورە کە ناوزەد کراوە لە قورئانی پیرۆزدا بە ( أسماو الحسنى ) . مامۆستا نوورسی "ڕەحمەتی خودای لێبێت " تازەگەریەکی گرنگی کردوە لەم باسەدا (1)، ئەوەش پاش ئەو کۆششانەی پێش خۆی کە لە راڤە کردن وبەڵگە بۆ هێنانەوە ، و پاشتر و بەقەڵەمی ئیمامی غەزالی "ڕەحمەتی خودای لێبێت " پێشکەوتنێکی تر ڕوویدا لەم بابەتەدا، ئەوەش بە باسکردنی بەشی مرۆڤ لەو ناوانەدا (2) ، بەلاَم مامۆستا نوورسی "ڕەحمەتی خودای لێبێت " هات تیشکدانەوەی ئەم ناوە پیرۆزانەی روون کردەوە لەسەر هەموو دروستکراوەکانی خودا ، وبازنەکەی فراوانتر کرد ونوێگەریەکی لە تێگەشتندا کرد ، بە شێوەیەك مرۆڤ هەست بە تەجەللیاتی ئەو ناوانە بکات لەهەموو درووستکراوو ڕووداوەکانی دەوروبەری ، بەشێوەیەك دەکەوێتە کەشێکی مەلەك ئاسا و هەردەم لەززەت وەردەگرێت لەهەموو کار و کاردانەوەکانی دەوروبەری ، ئەمە سەرەڕای هەستکردنی بەردەوام بە دەسەڵات و توانا و حیکمەتی خوای گەورە ، ودرووست بوونی گومان باشی و ئاسودەیی لە دڵ ودەروونندا بەرامبەر بە خودا ، و جێگیر کردنی واتای سوپاس گوزاری لە بیرو بۆچوون و هەڵسوکەوتەکانماندا .

لێرەدا نموونەیەك لەم بیرکردنەوەیەی مامۆستا نوورسی "ڕەحمەتی خودای لێبێت " دەهێنینەوە، بۆ زیاتر ئاشنا بوون:

مامۆستا لە کتێبی ( بریسکەکان / اللمعات ) و لە سەرەتای بریسکەی سیهەم ، و لەباسی ناوی پیرۆزی ( القدوس ) کە واتا گشتیەکەی بە واتای : پاك و خاوێن ، واتە لە زات و سیفەتەکانیدا خودای گەورە پاکە لە هەموو کەموکوڕی و ناتەواویەك . دەفەرموێت :

لە کۆتایی مانگی پیرۆزی شەعبان و لەکاتێکدا کە لە بەندیخانەی ئەسکی شەهر بەند بووم ، نوکتەیەك لە نوکتەکانی ئایەتی پیرۆزی : { والأرض فَرَشْنَاهَا فَنِعْمَ الْمَاهِدُونَ} ( الذاريات : ٤٨ ) (3) ڕوون بویەوە لام ، کە یەکێکە لە تەجەللیاتی ناوی پیرۆزی ( القدوس ) کە ئیسمی ئەعزەمە ، یان یەکێکە لە شەش نوورەکانی ئیسمی ئەعزەم ، وە روون بویەوە لام بەو هۆیەوە : بوونی خودا بە روونیەکی تەواو ، ویەکتایی خودا بە شێوەیەکی ئاشکرا .

پاشان مامۆستا درێژە بەباسەکە دەدات و شتێکمان لەو تیشکە نوورانیانە بۆ دەخاتە سەر کاغەز و نوسین کە هەستی پێکردووە لەم ئایەتە پیرۆزەو لەم ناوە پیرۆزەی خودای گەورە ، و دەفەرموێت :

گۆی زەوی و بگرە هەموو گەردوونم وەك کارگەیەکی گەورەی بەردەوام لە جوڵەدا هاتە بەرچاو ، کەوەك میوانخانەیەکی فراوان وایە ، یا خانەیەکی میوانداری کە بەردەوام پڕ دەبێت و پاشان خاڵی دەکرێتەوە ، دیارە جێگەیەك کە ئەم هەموو هاتووچۆیەی تێدا بێت و بەو گەورەییەش بێت دەبێت زبڵ و خاشاکێکی زۆری تێدا بێت و هەموو شتێك تیایدا تووشی پیس بوون ببێت ، بەشێوەیەك کە ژیان تیایدا زەحمەت بێت ، کەواتە بەردەوام دەستی خاوێن کردنەوە وڕێکخستن گەر نەبێت ئەوە مرۆڤ بەهۆی ئەو پیسیانەوە دەخنکێت و ژیان نابێت و ئاستەم دەبێت . کەچی هەست بە پیس بوون ناکرێت لەم میوانخانەیەدا ، و بگرە هەرچیەکی تێدایە بەشێوەیەك لە شێوەکان سوودی هەیە و بێ سوود نیە ، یان ناپێویست نیە و بێ هوودە نیە ، تەنانەت گەر ماددەیەکی وەك ئەمە دەربکەوێت یەکسەر و زۆر بە خێرایی بەبەرچاوەمانەوە دەخرێتە ناو چەندین ماکینەی ئاڵو گۆڕو دەبێتەوە ماددەیەکی خاوێن و باش .




کەواتە دەستی خاوێن کردنەوەیەکی بەردەوام لەپشت هەموو دروستکراوانەوە هەیە وبەردەوام چاودێری دەکات و ژیان دەپارێزێت لە فەوتان و زەوی و بگرە گەردوون دەپارێزێت لە پیس بوون ، با مرۆڤ لە خۆیەوە بڕوانێت ، کە گەر خۆی نەشوات و ژوورەکەی خۆی بۆ مانگێك خاوێن نەکاتەوە ، ئەوە ژیانی لا تەنگ دەبێت ، ئەی ئەبێت ئەم گەردوونە و ئەم خانە گەورەیە چی بەسەر بێت گەر خاوێن کردنەوەی تێدا نەکرێت بەبەردەوامی ؟

پاشتر ماملۆستا ئەو دروستکراوانەی ئەم کاریان پێ سپێرراوە کارەکەیان ناودەبات بە : کاری کارمەندی تەندروستی گشتی . لە مێرووله ووردەکان و کرمەکان و بگرە خرۆکە سپی و سوورەکانی لەشی مرۆڤ و



تەنانەت هەناسەی مرۆڤەکان کە خوێن بەهۆیەوە خاوێن دەبێت ، ورەشەباکان و هەورەکان وباران و ... هتد ، هەموویان ئەو بەرنامەیەیان تێدا چەسپێندراوە کە پارێزگاری لە خاوێن کردنەوە بکەن ، وهەر دروستکراوێك بەپێی کاری خۆی و لێهاتنی خۆی و گونجاوی کارەکەی خۆی هەڵدەستێت بەم کارەو بەدەم ئەم فەرمانەوە دەچێت ... کە هەموو ئەمانە لە نوور و فیوزات و بەرەکەت و بریسکە و تەجەللیاتی ناوی پیرۆزی ( القدوس ) ەوە سەرچاوە دەگرێت .

بابەتەکە درێژ ترە ، بەڵام بەدەسکاری و کورتکردنەوەیەکی زۆرەوە، ئەوەندەمان هەڵگۆست لە فەرموودەکانی مامۆستا.

کەواتە تازەگەری مامۆستا لەم ناوانەدا مرۆڤ و هەموو دەوروبەر و بگرە هەموو گەردونیش دەکاتە شایەتە زیندووەکانی دەرخستنی ناوە پیرۆزەکان ، وتەنها باس لە بنچینەی ناوەکان و بەڵگە نەقڵسەکان ناکات بۆیان ، تەنانەت دەبینین لەژێر سێبەری ئایەتی پیرۆزی سورەتی زاریات مامۆستا ئەم تەجەللیاتەی هەست پێ کردووە ، لەگەڵ ئەوەی کەلەکۆتایی سورەتی پیرۆزی حەشردا بە ئاشکرا ناوی پیرۆزی ( القدوس ) چەسپێنراوە بۆ خودای گەورە .

لەلایەکی ترەوە مامۆستا هەر لە بابەتی ناوە پیرۆزەکانی خودای گەورە ، ئەوە دەردەخات کە بە بیرکردنەوە و لە ئاوێنەی دڵە خاوێنەکانەوە گەر تەماشا بکەین ، دەتوانین تەجەللیاتی چەندین ناوی پیرۆز هەست پێ بکەین تەنها لەیەك دروستکراودا ، بۆ نموونە مامۆستا لە کۆتایی مەکتوبی هەشتەمدا دەفەرموێت : هەتاو ( خۆر ) ئەو لاپەڕە نوورانیەی خودای گەورە هەشت ناوی گەورەو پیرۆزی خودا تیایدا نومایانە ، کە دەگونجێت مەبەستی لە ناوە پیرۆزە گەورەکان : المصور ، النور ، الحکیم ، العلیم ، الخالق ، الکریم ، اللطیف ، الرحمن بێت ، کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون .

هەروەها مامۆستا لە ووتەی سی وسێ ، واتە نامەی : پەنجەرەکان ، ولە پەنجەرەی سی و یەکەمین ، و لە خاڵی یەکەمدا دەفەرموێت : مرۆڤ زیاتر لە حەفتا ناوی پیرۆزی خودای تێدا دیارو نومایانە. هەروەها لە تەنها یەك گوڵدا مامۆستا ڕوونی دەکاتەوە کە تەجەللیاتی نۆزدە ناوی پیرۆزی خودا تیایدا بە دیار دەکەوێت ، وەك لە ووتەی سی ودووەم ولە باسی یەکەم لە هەڵوەستەی سێهەمدا باسی لێوە کردووەو وەستاوە بەرامبەری .

بەم پێیە مرۆڤ گەر بەم بیرکردنەوەیە بچێتە خزمەت ناوە پیرۆزەکان ، ئەوە هەستێکی زۆر جیاوازی لا دروست دەبێت ، وخودا باشتر دەناسێت و هەست بە حازر بوونی دەکات لەهەموو هەڵسوکەوتێکدا وژیان تامێکی تری دەبێت ... بەو هیوایەی ئەم دەرفەتە کلیلێك بێت بۆ خوێنەری بەڕێز کە زیاتر لەم کەشە مەعنەویە سوود ببینێت لە ڕوانگەی پەیامەکانی نوورەوە. لە کۆتاییدا : بە هیوای دیدار...

پەراوێزەکان:

1.سەرەداوی ئەم بابەتە و ناوزەدکردنی بیری مامۆستا نوورسی "ڕەحمەتی خودای لێبێت " لەم خوێندنەوەدا بە (تازەگەری) ، لە جەنابی د. محسن عبد الحمید گوێ لێ بووە لە ساڵی ٢٠١٥ لە شاری هەولێر .

2.ئەوەش بە نوسراوە بە پێزەکەی : المقصد الاسنی فی شرح معانی أسماو الله الحسنی . کە چەندین جار لە چاپ دراوە و تیایدا بۆ دەرخستنی پەیوەندی ئەو ناوە پیرۆزانە بە مرۆڤەوە و لە کۆتایی ناوە پیرۆزەکاندا ، دەفەرموێت : ( وحق العبد من هڏا الإسم ....) .

بنوارە : کتێبی ناوبراو : بۆ نموونە لاپەرەکانی ( ٦٢ ، و ٧١ ، و٧٨ ، و٨٠ ، و١٢٧ و١٤٠ ، و١٤٣) ، چاپی یەکەم ، لێکۆڵینەوەو لێتوێژینەوەی : بەسسام عبد الوهاب الجابی ، بڵاوکردنەوەی : جفان وجابی ـ قوبرص ١٩٨٧م.

3. بە واتای : زەویمان ڕام هێناوە و ڕامان خستوە بۆ ژیان و ئارامیمان تیایدا جێگیر کردووە، و ئێمە باشترین ڕاخەر و ئاسانکار و کارسازوکار ڕێکخەرین .



د. ئومێد نەجمەددین موفتی



# بەسەرهاتێکی شێخی بوتی

سەرۆکی زانکۆی لازقییە (زانکۆی تشرینی ئێستا) لە ساڵی 1972 دا بانگهێشتی سەرجەم مامۆستایانی ئەوکاتی زانکۆکەی کرد بۆ ئێوارەخوانێك لە ماڵەکەی خۆیدا بە بۆنەی تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر دامەزراندنی زانکۆکەدا. دکتۆر بوتیش لەو کاتەدا ڕاگری کۆلێجی شەریعە بوو لە زانکۆی دیمەشق و، سەرەڕای مەشغەڵەت و سەرقاڵییە زۆرەکانی ڕەزامەندی دەربڕی بوو کە هەموو چوار شەممەیەك لە دیمەشقەوە بێت بۆلامان بۆ وتنەوەی وانەی ( القران الکریم) لە بەشی زمانی عەرەبی، ئێمەش ئەو شەوە میوانداریمان دەکرد بۆ ئەوەی دوانیوەڕۆی ڕۆژی پێنج شەممە بگەڕێتەوە بۆ دیمەشق.

منیش ئەوکات کارم دەکرد لە دامەزراندنی کتێبخانەی زانکۆدا، ئەوکات ئەو کتێبخانەیە بوونی نەبوو پێشتر و، وارێکەوت سەرۆکی زانکۆ سەردانی کردم لە ژورەکەی خۆمدا و لە کاتێکدا من لە پێشوازی دکتۆر بوتیدا بووم، سەرۆکی زانکۆ پێشنیاری ئامادەبوونی ئێوارەخوانی ڕۆژی پێنج شەممەی بۆ کردین. بە سوپاسەوە من خێرا داواکەیم پەسەند کرد و، بەڵام دکتۆر بوتی بە میهرەبانییەوە داوای کرد کە مۆڵەت لە باوکی وەربگرێت لە پێشدا کە لە دیمەشقە!

نەمدەزانی کاممان زیاتر تووشی شۆك بوین، من یاخود سەرۆکی زانکۆ؟ خۆ ئەگەر هەر پاساوێکی تری بهێنایەتەوە بێگومان ئاسایی بوو، بەڵام مامۆستایەکی زانکۆی بەتەمەن لە چل ساڵی تەمەنیدا (بە نزیکەیی) و منداڵەکانی ـ ماشاء الله ـ ئێستا خوێندکاری زانکۆن و، ڕاگری کۆلێجێکی گەورەی وەکو کۆلێجی شەریعەیە و، لە زانکۆیەکی گەورەی وەکو زانکۆی دیمەشقە ، داوای مۆڵەت لە باوکی دەکات بۆ ئامادەبوون لە ئێوارەخوانێکدا و مۆڵەتی زیاتر مانەوەی لێوەردەگرێت لە لازقییە لە ئێوارەی پێنج شەممەوە بۆ بەیانی هەینی؟ کاریگەری ئەم هەڵوێستە لەسەر من و سەرۆکی زانکۆ کە نیشانەی سەرسوڕمان لەسەر ڕووی دەرکەوتبوو وەك کاریگەری هەورە بروسکە وابوو و، لەگەڵ ئەوەشدا سەرۆکی زانکۆ توانای خۆی کۆکردوە و ئاماژەکانی دەموچاوی گۆڕی بە خێراییەکی سیاسیانەی دانایانە و ڕووی کردە من و وتی: بەسسام لەگەڵ دکتۆر بوتیدا بۆ ژورەکەی من بڕۆ بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ بە تەلەفۆنەکەی من و لەوێوە پەیوەندی بە باوکیەوە بکات.

هێشتا سەرسوڕمانەکە کۆتایی نەهاتووە، لە ژورەکەی سەرۆکەوە دکتۆر بوتی دەسکی تەلەفۆنەکەی گرت بە دەستەوە و گوێم لێبوو بەم وشانە باوکی دەدواند لە تەلەفۆنەکەدا کە هەوڵ دەدەم وەکو خۆی بە دەق بۆتان بگێڕمەوە:

ـ سڵاوی خواتان لێبێت باوکە گیان

ـ بەڕێز سەرۆکی زانکۆ بۆ سبەی ئێوارە من و سەرجەم مامۆستایانی بانگهێشت کردووە بۆ ئێوارەخوانێك، ئایا دەتوانم ئامادەی ئەو خوانە ببم و بەیانی ڕۆژی هەینی بگەڕێمەوە بۆ دیمەشق؟

ـ سپاس باوکە گیان... سڵاوی خواتان لێبێت

دەسکی تەلەفۆنەکەی داناو منیش بە موجامەلەوە پێم وت: سوپاس بۆ خوا، بەم شێوەیە کاروبارەکان ئاسان بوون و ئێستە بە دڵنیاییەوە دەتوانن بمێننەوە و، سەرسوڕمانی دووەم لە زاری شێخەوە چاوەڕێی دەکردم:

ـ نەوەڵا، ناتوانم، باوکم ڕازی نەبوو

هیچ کات وێنای ئەو سەرسوڕمانەی سەر دەموچاوی من و، سەرۆکی زانکۆشت نەدەکرد کاتێك بە وردی ئەوەی لە تەلەفۆنەکەدا رووی دابوو بۆم باسکرد.... ئایا ئەوە باوڕ پێکراوە؟! هیچ موناقەشە و گفتوگۆ و زۆرلێکردن و، تەنانەت وشەی داوالێکردن یاخود هەوڵی ڕازیکردنی باوکی نەدا! (نا) واتە (نا) و تەواو. جیلی تازەی ئەمڕۆ چی دەڵێن کاتێك گوێبیستی ئەم چیرۆکە دەبن و، ئایا هەندێکیان هەوڵی ئەوە دەدەن ئەم کارە لەگەڵ خۆیان و باوکیاندا تاقی بکەنەوە ئەگەر بۆ جارێکیش بێت؟

لەمە سەیر تر پێش چەند ساڵێك کاتێك دکتۆر بوتیم پێشکەشی ئامادەبوان کرد لە ئەکادیمیای ئۆکسفۆرد کاتێك ئامادە بوو وتەکەی پێشکەش بکات و، گوێی لە من بوو کاتێك ئەم بەسەرهاتەم بۆ باسدەکرن، بە ئارامی سەیری کردم وەکو یەکێك کە چاوەڕێی پاشماوەی بەسەرهاتەکەیە و چاوەکانی پێم دەڵێت: بەڵێ؟ جا ئەمە چی تێدایە؟ کوێی ئەم بەسەرهاتە جێی سەرسوڕمانە؟

تب: شێخ محمد سەعید ڕەمەزان بوتی زانایەکی گەورەی کورد بوو، چەند ساڵێك لەمەوپێش لە سوریا شەهیدیان کرد.



میران مجید

# نوێژ لە دیدی مەولانای ڕۆمی



یەکەمین کەسانێك کە هێڵی پەیوەندی گەیشتە ماڵ و شوێنکاریان دەوڵەمەندەکان بوون ئەویش بەبۆنەی کاری زۆر و ئیحتیاجی خەڵك بوو بەوان، باشترینی دەوڵەمەندەکانیش ئەوانەن کە بێ فیزن و خۆیان وەڵامی پەیوەندییەکان دەدەنەوە، گوێ بۆ خەڵك دەگرن و داوا و خواستیان بەجێدەهێنن.



ئەو نمونەیەمان بۆ ئەوە هێنایەوە تا لە مانای بەرزی پەیوەندی نەپچڕاوی خودا و خەڵك حاڵی بین. خودا بەو هەموو شکۆ و مەزنییەی خۆیەوە ڕاستەوخۆ گوێ لە نوزە و نوێژ و نزوولەی بەندەکانی خۆی دەگرێ و بەپێی ویستی خۆی باوەگۆیان دەداتەوە هەڵبەت بێ عەریزە و پرسگە. بەندە لەڕێی نوێژەوە ڕۆژانە لەگەڵ پەروەرێنی حەق دەدوێ و ڕازونیازی لەتەکدا دەکا. نوێژ جیهانی ناسوت بە جیهانی لاهووت گرێدەدا ، بەندە لە دونیای مادده بۆ دونیای مەلەکووت بەرز دەکاتەوە. ئەو نوێژە بۆ بەندە باشە کەچی وازلێهێانی خوا تووڕەدەکا، سەیرە!

خودا نوێژی لەبەر خۆمان دەوێ تا لێی دانەبڕێین، لێ هەموو نوێژێکیش وەرناگرێت، تەنیا و تەنیا نوێژی سپی قەبوڵ دەکا.
نوێژی سپی بەو نوێژە دەگۆترێ کە دڵ و ڕۆحی بەندە ئامادەیی هەبێ هەروەکو مەولانا دەفەرموێ:

بشنو اخبار ێن صدر صدور
لا صــلاه تم إلا بــالــحضور

واتە: گوێبدە فەرموودەی سالاری عالەم پێغەمبەری مەزن(د.خ) کە دەفەرموێ نوێژ تەواو نابێ تا دڵ و ڕوح تێیدا ئامادە نەبێ.
نوێژ گلێنەی چاوی عاشقانی خودایە. دڵسۆزانی خودا بێ نوێژ ژیانیان تەڵخە، مەولانا لەوبارەیە دەفەرموێ:

پــنـج وقـت ێمد نـمـاز و رهـنـمـون
عــاشـقــان را فــی الـصـلاه دائـمـون
نــه بــه پـنـج ێرام گـیـرد ێن خـمـار
که در ێن سرهاست، نـی پانصد هزار

واتە: خەڵکی ئاسایی لە پێنج کاتی دیاریکراودا پێنج نوێژیان هەیە، بەڵام عاشقان بەوەندە داناکەسێن، بە بەردەوامی لە نوێژدان. ئەو دڵسۆتانە سەرمەستی خودان و ئۆقرەیان نییە، نەك بە پێنج نوێژ بەڵکو بە پێنج سەدیش بڕستیان ناشکێ.
لە مەسنەویدا چەندین جار باسی نوێژ کراوە مەولانا نوێژی بە سەفەر چواندووە. سەفەرێك بە الله اکبر دەستپێدەکا و بە سەلام و ڕەحمەتی خوا کۆتایی دێ.



# کۆچ

## بۆ خۆگونجاندە لەگەڵ ژینگە!



کۆچە بەکۆمەڵە وەرزیەکانی بوونەوەرەکانی وشکایی و ئاویەکان لە گیانەوەر و باڵندە و جۆرەها ماسیەکان کە ساڵانە لەسەر بەرنامەیەکی داڕێژراو هەزاران کیلۆمەتر دەبڕن، لە کات و ساتێکی دیاریکراو بەپێکهاتەیەکی ڕێك و پێك و پشتی یەك دەگرن لە گەشتێکی سەخت و دژوار و پڕمەترسیدا و ساڵانەش دووبارەی دەکەنەوە. مەبەست لەو گەشتەیان ئەوەی تا ئێستا زانراوە بۆ:

- ساردی و گەرمی و گۆڕانکاری کەش و هەوای ساڵانە.
- خۆراك و زاوزێ ، و گەیشتن بە ئاوی سازگار وشیرین. بێگومان لەو سوورە بە دەورە ژمارەیەکی زۆریان لێ دەمرن و دەبنە قوربانی. بەڵام وەك ئامادەسازی بۆ ئەو گەشتە پێشوەختە چەوریەکی زۆر کۆدەکاتەوە بەکاری دەهێنی لە کاتەکانی کەمی خۆراك و وزە. وە شێوازی هەڵفرینیان لە شیوەی پیتی (V) ئینگلیزیە بۆ ئەوەی ڕابەرەکەیان وەك سەرە ڕمح پالەپەستۆی هەوا دەبڕی وە ئەوەی سەرنج ڕاکیشە لەو کۆچەیاندا سەیریان کرد کە باڵندەکان توانایان هەیە بیست سەعات بەیەك قۆناغ ببڕێت بێ وەستان و هەندێ کەژاوەی ئەو باڵندانە توانای هەڵفرینیان هەیە لە بەرزی لە (900 تا 4.5)نۆسەد مەتر تا چوار کیلۆمەتر و نیو. سەیردەکەین ئادەمیزاد لە گەشتەکانیدا جۆرەها ئامێری پێشکەوتوو و سەردەمی بەکاردەهێنی وەك (G PS و قیبلەنامە و کۆمپیوتەر و کامێرای لیزەری و تیشکی شەوانە بێتەل و ڕادار و جۆرەها نەخشە...هتد). بەشێك لەزانا زاناکان پێیان وایە کە ئەو کۆچە بەرنامە داڕێژراوە لەناو مێشکی بوونەوەرەکان وەك چووبێتە ناو جیناتەکانی و کۆپی بووە لەناو مێشکیان لە دوای چاخە بەستەڵەکەکانەوە ئێستاش ئەو بەرنامەیە دووبارە جێبەجی دەکەنەوە. بەڵام بەرەی دووەمی زاناکان پێیان وایە نەخێر ئەو بوونەوەرانە هەست دەکەن بە هاتنی چەرخێکی تری مەترسیدار لە هاوشێوەی چەرخە بەستەڵەکەکانی تر کە گەرمی کت و پڕ و ساردی لەناکاو دووچاری گۆی زەوی و ژینگەی ئەو بوونەوەرانە هاتووە و ئەوان هەستیارترن و بەئاسانی هەستی پێدەکەن و لە کۆچە وەرزیە بەکۆمەڵەکانیان سوود لە میمۆری(ژاکرە)ی خۆیان و بواری موگناتیسی زەوی و تیشکی ڕۆژ و شەپۆلەکانی ئاو و ئەلتراسۆنیك بواری کارەبایی(مجال الکهربائی) و بۆن و جۆرەها ئیفرازات و نەخشەی جوگرافی زەوی و ئاسمانی و جیۆپۆلیتکەکان و هێلی پان و درێژی و شوێنگەی ئەستیرەکان و لێواری دەریاکان و با و کەللوی ئەستیرەکان دەنگ و ئیشارات ....وەردەگرن و لە شەوانیش ئەستیری جەمسەری(النجم القگبی) دەکەنە نیشان.

وە هەروەها هێلە موگناتیسیەکانی و قیبلەنامە بۆ کاتەکانی هەور و تەم و مژی بەکار دەهێنن سەرکەوتووانە ئەو کۆچە بەکۆمەڵانەیان ئەنجام دەدەن، وە بۆ ئەو مەبەستەش دەزگا زانیارییەکان بەدەیان وێستگەی چاودێری جێگیریان دامەزراندووە لەسەر چیاکان و بیابانەکان و ژێر دەریاکان و لێوارەکانی بۆ بەدواداچوون و زانینی ڕەوشت و ڕەفتاری ئەو گیانەوەرانە بۆ دۆزینەوەی نهێنی صندوقی ڕەشی ئەو گەشتانە. وە لە شارەکانیش بوار ڕەخساوە کە هاوڵاتیان بەشداربن لە دەرکەوتنی ساڵانەی ئەو باڵندانە بۆ دەڤەرەکانیان لە ڕێی ماڵپەری ئەلیکترۆنی و ئیتر ئەو خزمەتە وای کردووە کە بزاندری لە ماوەی ئەو بیست ساڵەی ڕابردی کۆچی باڵندەکان سێ هەفتە زووترە مێروولە هەیە لە قولایی ئەفریقیا بەشەو و ڕۆژ هەڵدەفڕی و بەسەر دەریای سپی ناوەڕاست و بەرە و ئەوروپا و چیای ئەلب و فەرەنسا و نۆکەندی مانش دادەڕوات تا دەگاتە ئینگلتەرا. پەپولە لە مەکسیکەوە تا کەنەدا و گەڕانەوەی بۆ سەرهەمان چڵی ئەو دارەی کە زێدی باب و باپیرانیەتی نزیکەی 2000 میل دەبڕی لە گەشتە ساڵانەکەی. هەندی باڵندەی جەمسەری خوارووو نزیکەی 12 هەزار میل دەبڕی تا دەگاتە جەمسەری باکوور بۆ زاوزی کردن. . لەوانەش ئەو بوونەوەرانە توانیان بە درێژای ملیۆنان ساڵ خۆیان بگونجێنن لەگەڵ پێشهاتە سەختەکانی ژینگە بەوەی توانانی خۆ شاردنەوە و حەشاردانیان هەبووە و فیل و حیلەی ژێرانەیان بەکارهێناوە پلان و حیکمەیان هەبووە، وە ئەو ئارامی و دان بەخۆگرتنە بووە هێما و سیبمولی سەرکەوتنیان، ئیمەی مرۆڤیش دەبی بەدوای لوغز و نهێنی صندوقە ڕەشەکەی ئەوانە بین.

ئەندامی ئەنجومەنی باڵای دەستەی پاراستن و چاککردنی ژینگە



حاجی سلام کریم سیدان



# چەند پەیڤێك دەربارەی فەرموودە



ئەو کەسانەی تەنیا بە فەرموودەکانی پەیامبەرەوە گرتوویانە و پێیان وایە پڕن لە ئەفسانە و بابەتی نالۆژیکی و لەگەڵ هۆش و زانستدا ناتەبان، یاخود بێئاگان یان خەڵکی بە گێل دەزانن! ئەگەرچی ئەم بابەتە پێویستی بە ڕووبەری فراوانترە و ڕەنگە لێرە هەقی تەواوەتیی خۆی وەرنەگرێت، لێ تا کاتێك کە دەرفەت پەیدا دەبێت، با ئەم چەند دێڕە وەك سەرەتایەك هەبێت، سا بەڵکو سوودێکی هەبوو. گومانی تێدا نییە هۆشی مرۆڤی چاخی نوێ گۆڕانی بەسەردا هاتووە و گۆڕاوە. هۆکارەکانیش زۆرن و باسکردنیان لەم نووسینەدا بە پێویست نازانم. مرۆڤی ئەم ڕۆژگارە باوەڕی بە میتافیزیك لاواز بووە و ڕووی لە ماددیگەرایی کردووە، بینایی دڵی کز بووە و چاوی سەری تەنیا بەردەم پێی دەبینێت. ئەم سەردەمە خەڵکی لە دین دڕۆدنگن و زانستیان بە خوای خۆیان هەڵبژاردووە. لەم نێوەندەدا سەیر نییە کەسانێکی دینداریش، بگرە پسپۆڕی بواری ئایینیش، لەژێر کاریگەریی هەژموونی ڕای باوی دنیای نوێدا، گومان لە دەقە بنچینەییەکانی ئایین بکەن و لای بە لادا بکەنەوە و هەوڵ بۆ تەتەڵەکردن و لەبێژنگدانی دەقەکان و هەروەها گونجاندنیان لەگەڵ زانست و ڕای باودا بدەن.

وەك دەزانرێت خەڵکێکی زۆر ئەمڕۆکە ڕوو لە بێباوەڕی دەکەن، هۆکاری ئەمەیش دیسان زاڵبوونی دیدی زانستسەنتەرە بەسەر دنیادا، زۆر کەس ناتوانن لەنێوان هەژموونی بیری زانستی و باوەڕە بۆماوەییەکانیاندا هاوسەنگی ڕابگرن و زۆر جار بەبێ وردبوونەوەیەکی قووڵ دەستبەرداری ئایینەکەیان دەبن و جاڕی بێباوەڕی دەدەن. لەولایشەوە خەڵکانێك هەن ورد و درشت بە ڕووکەشی دەقە بنچینەییەکانەوە پابەندن، تا ڕاددەی وشکهەڵاتن و چەقبەستوویی و خەیاڵدانیان خەیاڵدانێکی مێژوویی و دوور لە واقیعە و بە جەستە لێرەن و بە خەیاڵ لە زەمان و جوگرافیایەکی دیکە.

لەم نووسینەدا قسە لەسەر ئەم دووانە ناکەم، بەڵکو بە کورتی لەسەر جۆری سێیەم دەدوێم، ئەمانە کەسانێکی ئایینین، وەلێ دەیانەوێت دەستبەرداری هیچکامیان نەبن، لەناو ئەم مرۆڤانەیشدا چەند جۆرە بیرکردنەوەیەك هەن، ئەوەی مەبەستی منە ئەو جۆرەیانن کە بە دەقەوە خەریکن و گرنگیی پێ دەدەن، کەچی خودان هۆشێکی نادینین. بۆیە هەوڵ دەدەن گومان بخەنە سەر هەندێ دەقی بنچینەیی، لەو دەقانەی کە بە گوفتاری پەیامبەری ئیسلام دادەنرێن و پێیان دەگوترێت فەرموودە (الحدیث). وردە وردە هەرچی شتێك ئەقڵیان نەیگرێت لە تەتەڵەی دەدەن و وەلایەوە دەنێن، لەم کارەیشدا وەك زانایانی پێشین پشت بە زانستی سەنەد و جەرح و تەعدیل نابەستن، بەڵکو پێوەریان گونجانی ئەو فەرموودانەیە لەگەڵ ئاوەزدا.

خاڵی چەقی ئەم نووسینە وروژاندنی پرسیارێك وپاشان وەڵامدانەوەیەتی، پرسیارەکەیش ئەمەیە: کاتێ حەدیسی پەیامبەر گومانی دەخرێتە سەر و ڕەتدەکرێتەوە بەپاساوی ئەوەی شتی نامەعقوولی تێدایە و ناشێت گوتەی وا لە زاری کەسێکەوە دەرچووبێت کە پەیامهێنی خودا بێت، دەڵێین ڕاستە، لێ ئەی ئەگەر هەمان ئەو شتە بە قەولی ئەوان گوتەنی نامەعقولانە لە قورئاندا هاتبوون، ئەو وەخت چی بکەین و چۆن چارەسەری وەها گرفتێك بکەین؟

ب

یرتان دەخەمەوە کە قورئان پڕپڕە لە حەکایەت و بەسەرهات و پێشبینیی ئەوتۆ هیچیان لەگەڵ ئەقڵی زانستیدا وێکنایەنەوە. هەر بۆ نموونە چەند شتێکتان بیردەهێنمەوە:

1. ئەقڵی زانستی قبووڵ دەکات کەسێك بە بێ باوك و دایکت بێتە دنیاوە؟ یان کەسێك تەنیا دایکی هەبێت و ئاتاجی باب نەبێت بۆ ئەوەی بێتە دنیا؟ دەی ئادەم و عیسا لە قورئاندا باسیان هاتووە نەك فەرمووده.

2. لە ئەقڵی زانستیدا جێی دەبێتەوە کەشتییەك هەبێت لە هەموو جۆرە بوونەوەرێك جووتێکی تێدا جێ ببێتەوە؟ دەی کەشتییەکەی نووح لە قورئاندا باس کراوە نەك فەرمووده.

3. لە کوێی هۆشی زانستگەرادا جێی دەبێتەوە حوشترێك لە بەردێکەوە پەیدا ببێت؟ حوشترەکەی ێاڵح پەیامبەر لە قورئاندا هاتووە.

4. پەلەوەرێك پارچەپارچە بکرێت و ڕاستەخۆ پارچەکانی هەڵستنەوە و ییك بگرنەوە ڕێی تێ دەچێت؟ ئەی مەگەر ئەو ڕووداوە لە قورئاندا نەهاتووە، وەختێ ئیبراهیم پەیامبەر داوای بەڵگەی زیندووبوونەوە لە خودا دەکات؟




5. ئەدی ئەوە لە حەدیسدا باس کراوە یان لە قورئاندا، کە ڕۆژێك دێت خودا ئاژەڵێك (دابە) دێنێتە ڕووی زەوی کە لەگەڵ مرۆڤەکاندا بە زمانی خۆیان دەدوێت؟

6. ئایا ئەقڵی زانستی باوەڕی بە فریشتە و جنۆکە هەیە؟ ئێ خۆ ئەو دووانە لە دەینا شوێنی قورئاندا باس کراون.



ئەگەر بمەوێت نموونە بهێنمەوە، بەم زووانە لێ نابمەوە، کورد گووتوویە مشتێك نموونەی خەروارێکە. ئێستا دووبارە ڕووی دەمم لەو کەسانە دەکەم کە خۆیان بە مسوڵمانێکی تەواو دەزانن و بە پاساوی پابەندبوون بە قورئانەوە، هەرچییەکیان بەد ڵ نەبێت لە فەرموودەکانی پەیامبەر ڕەتی دەکەنەوە و لێیان دەپرسم: کام فەرموودەیە لەم جۆرە (ئەفسانانە)ی قورئان زیاتریان تێدایە، هۆکاری پایەندبوونتان بە قورئانەوە چییە و بۆ هەندێ لەو ئایەتانەی باسکران ڕەتناکەنەوە؟ گرنگە بزانین ئاوەزی ئایینی و ئاوەزی زانستی دوو شتی جودان و مرۆڤ دەبێت یەك لەو دووانە لە لای خۆی بەسەر ئەویترياندا زاڵ بکات و بیکاتە بنچینە بۆ ڕاڤەی ئەویتریان. ئیدی چۆن باوەڕ بە خۆی دێنێت ئەوە کاری خۆیەتی و خۆی دەبێت بدیۆزێتەوە، لێ کەسێك کە لەو نێوەندەدا چەقی بەستووە، بە سادەترین پرسیار دەڕووخێت و هەرچی ڕێسی هەیە دەبێتەوە بە خوری. ئاخر کەی ڕەوایە



م.هێمن خورشید

# نامەیێکی مامۆستا مەلا محمدی جەلی زادە (مەلای گەورەی کۆیی) بۆ شێخ محمد ئەمینی بێژوێ.

مامۆستا مەلا محمدی جەلی زادە کە بە (مەلای گەورەی کۆیی) ناسراوە کوڕی مەلا عبداللە کوری مەلا ئەسعەدی کوڕی مەلا عبداللە جەلی زادەی کۆییە .یەکێك بووە لە گەورە زانایانی کورد کە لە کۆتای سەدی نۆزەی و سەرەتای سەدەی بیستەمی زاینیدا ژیاوە(1876 _1943) ز.مەلای گەورە: بەوە ناسراوە یان ڕونتر بڵێن لەنێو کوردانda بەوە ناسراوە کە دوژمنێکی سەرسەختی .(تەسەوف) و ڕێبازەکانی سۆفیگەری بووە لە کوردستان .بەڵام لێردا دەمەوێ دەقی ئەو نامەیە بڵاوکەمەوە کە (مەلای گەورەی کۆیی) بۆ جەنابی (شێخ محمدئەمینی بێژوێ) ناردویەتی و لە شیعرێکی چەند دێڕیدا هەم وەسف و هەم داوای هیمەت لە شێخ دەکات .شیاوی باسە ئەو نامەیە پێش ئەوە بووە کە (مەلای گەورە) نیەتی بووە تەفسیرە بەناو بانگەکەی خۆی بنوسیت .کە(تەفسیری قورئانی پیرۆزە) .لەو شیعرەی مەلای گەورەی کۆیدا وەدەر دەکەوێت کە مەلای گەورە دژی هەموو شێخێك و دژی تەسەوف نەبووە بەڕەهائی بەڵك و تەسەوفی ڕاستەقینە و مەشایخی ڕاستەقینەی خۆش ویستەوە بەتایبەتی مەشایخی (بیارە و بێژوێ)لێرەدا بەپێویستی دەزانم چەند دێڕێك لەشیعرەکەی مەلای گەورە بنووسم کە بۆ شێخ محمد ئەمینی بێژوێ نوسیویەتی.شیاوی باسە دەقی شیعرەکە لە کتێبی ( خواناسان و ناودارانی کورد ناوچەی ئالانی سەردەشت و پشدەر)دا نوسراوە و دەڵێ:



ئـەی شێخی شەریف و عالەم و ژیر
ئەی ئەوکەسەی جێ یە پێی بڵێم پیر.
ئەی شێخ ئەمین تۆی شێخی ئـەمین
تۆ لە قسەم حاڵی نەك گـەلی فەقیر.
حـاڵی بـەد حـاڵی قـەومی بێ چارە
بـداتـە غیری قـسەت بە تـەئـسیـر.
بابم مـوخڵیص بوو لە بۆ شێخ عومەر
من مـوخڵیصی تۆم بێ زۆر و تەزویر.
بـە کـۆلکە شێخ و بـەکـۆلـکـە مەلا
دین و ژینی گـەل تـالانـە و تـەئسیر.
مـەڵبەنـدی ئـالان و مەڵبەندی کـۆیی
هـەر لە کـۆنـەوە بـە کێشـەو گـیر.
درالـعـلم بـوون جـێـی بـوژانـەوە
بێشەی ڕۆڵەی دین عەلامـەی نـیحریر.
ئێستاش وانـــۆرە لـــە دەوری زەمـان
هــاتە سەر تۆ و من بەئەمری تـەقدیر.
یاشێخ من لێرە لـەجیاتـی دەروێشی
کـارم ئیرشادە و تــەدریسە و تەقـدیر.
دەرسی عولەما و هـەم دەرزی عـەوام

خـەو خواردنم نـووسیـنە و تـەحریر.
بـەلەفزی کـوردی  شیرینی بـێ گـەرد
نـیازم وایە دەستکـەم بـە (تــەفسیر)
بـکـە (هیمەتێ) مونکیر نیـم بـۆ تـۆ
مـونکـیـرم لـە بـۆ منکیر و نــەکیر.
ئـەو مـونکـەراتـەی ئــەو مونکـەرانە
دوورە لـە مەعاریف دڵ ڕەش وەك قـیر.
شێخی وەك کـۆلـکە مەلای بـێکـەڵـك
بانگ ئـەکـەن لـە خەڵك بۆ بئس المصیر.
ڕەفیقـی(ئـەمین) ئـەشێ بـۆ تـەریـق
وەك خچر و مـوسا جـامە بۆ دڵگـیـر.
ئـەگـەر مـەیلت بێ مـەیـلم بـەتینـە
لـەیلی بێ مـەیـل نـەبـەخشێ زنجیر.
ئـەنــازم پــێـت و دوعــا ئــەخوازم
حـسبنـــا الله ونــعــم الــوکـیـل
ربنـــا ارزقـــنـــا حـسن الخــتـــام
انــك انـــت الســمــیــع البــصــیــر.

جەلی زادە(محمد کۆیی)

شایەنی باسە مامۆستا شیخ محمدئەمین بێژوەیی.یەکێك بووە لە عالم و عاریفە هەرگەورەکانی کورد کە ناوی تەواوی :ماموستا شێخ محمد ئەمینی کوڕی شێخ ئەحمەدی سەراوی ، لە دەوری ساڵێ(1860ز )لە دایك بووە . لای ماموستا (مەلا عبدالقادری کانی کەبودی) لە (بیارە) خوێندنی مەلایەتی کردوە ، هێزی مەلایەتی وفەتوادانی پەیدا کردوە.ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتوە و ، لە لای (شێخ عومەری بیارە). کراوە بە خەلیفەی (تەریقەتی نەقشبەندی) لە ناوچەی (بێژوێ) سەر بەشاری (سەردەشت)ی ڕۆژ هەڵاتی کوردستان،. لەوێ دەستی کردوە بە مەلایەتی و دەرس دانەوە و ئیرشاد . لەساڵی 1960کۆچی دواى کردوە.

سەرچاوەکان.
1/مەلا گاهری مەلا عبدالله بەحرکەی ، (مێژووی زانایانی کورد )، چاپی یەکەم چاپخانەی ئاراس ، ساڵی 2010 ز،بەرگی سێیەم.
2/عبدالکریم المدریس ،(علماونا فی خدمە العلم والدین) ، الگبعە الاولی دارالحریە الگباغە بغداد 1983ز
3_ئەحمەدی مەلا صالحی بێژوەیی ئالانی ، (خواناسان و ناودارانی کورد ناوجەی ئالانی سەردەشت و پشدەر) ، چاپی یەکەم ، ساڵی 2006 بەرگی. یەکەم.



محمد ئالی

# دەرمانخانەی سروشتی ماڵ

## ( شفتی ) (بطيخ احمر ،،، رقي)( melon )

## Citrullus lanatus



شوتی یەکێکە لەو میوانەی کە زۆرترین ئاوی تێدایەو بەتایبەتی لەوەرزی هاویندا فێنکیت پێدەبەخشێت، هەروەها لەشوتیدا ئەو ماددانە هەن کە دەبنە هۆی چالاککردنی خانەکانی جەستەی مرۆڤ. شوتی بۆ یەکەمجار لەئەفریقا دۆزراوەتەوەو تەنها لەو وڵاتانەشدا پێدەگات کەگەرمن، بەهۆی ئەوئاوەزۆرەی کە تێیدایە (٪90)ی تینوێتی دەشکێنێت.

شوتی یارمەتی دابەزاندنی کێش دەدات، بەهۆی کەمیی کالۆرییەوە، چونکە لە (100) گرام شوتیدا ڕێژەی کالۆریی (24) ە. ڕێژەی شەکر لەشوتیدا کەمە . هەروەها یارمەتی گۆڕینی ماددەکان دەدات لەجەستەی مرۆڤدا بەبێ ژەهراویبوون.

بۆ پێست بەسوودو پێویستە چونکە بەڕێژەیەکی زۆر ڤیتامین (A) و (C)ی تێدایە، کە ڤیتامین (A) یارمەتی گۆڕینی ماددەکانی پێستی مرۆڤ دەدات، وە زۆریی ئاو لەشوتیدا یارمەتی تەڕبوونی پێست دەداتو لەوشکبونەوە دەیپارێزێت.

شوتی (بێتا کارۆتین)ی تێدایە کە بەرگریو پارێزگاری لەمرۆڤ دەکات لەماددە زیانبەخشەکانی، وەك (نیکۆتین، دەرمان، حەب، دوکەڵی ئۆتۆبێلو چەندین ماددەی ژەهراوی تر).

ڤیتامین (C)یش یارمەتی بەرگری جەستە دەدات، وە شوتی وریاتدەکاتەوەو وزەیەکی باشت پێدەبەخشێت.

سوودێکی تری شوتی ئەوەیە، کە سارێژی هەوکردنی برین دەکات، وە ئەو (ناتریۆم)ەی کە تێیدایە، دەبێتە هۆی دابەزاندنی کێش.

پارێزگاری دەکات لەگورچیلەکان و ڕێگری دەکات لە دروستبونی بەرد لەناو گورچیلەکاندا.

دژە هەوکردنێکی بەهێزە بۆ جەستە.

بەرگری جەستە بەهێز دەکات و ڕێگری دەکات لە تێکچونی خانەکانی جەستە.

تەندروستی دڵ دەپارێزێت ،سوڕی خوێن چالاکدەکات.

زۆر بەسودە بۆ چاوەکان.

هۆکار دەبێت بۆ تواندنەوەی چەوری زیادەی جەستە.

بەهێزکەری جنسی پیاو و ئافرەتە

ئێسکەکان بەهێز دەکات.

ماسولکەکان پتەو دەکات.





د. بدر قادر سورچی

# لەبەرچی ئەبو هورەیرە زۆرترین ریوایەتی هەیە؟




زۆری ژمارەی ریوایەتەکانی ئەبو هورەیرە، بابەتێکی کۆنی نوێ، بابەتێك کە لە سەردەمانی پێشوو گفت و گۆی لەسەر کراوە، لەم چەند ساڵەشدا نوێ کراوەتەوە و قسەی زۆری لەسەر دەکرێ، چەندین ژمارەی لەیەکتری جیاواز دەگوترێ، سەرەتا با لێکۆڵینەوەیەك بۆ ژمارەی ریوایەتەکانی بکەین، ئایا درووستە کە چەند هەزار فەرموودەی گێڕاونەتەوە؟.

بۆ زانینی ژمارەی دروستی ریوایەتەکانی کە لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاونەتەوە، کۆنترین سەرچاوە کە زۆرترین ژمارەی فەرموودەکانی ئەبو هورەیرەی هێناوەتەوە، موسنەدی ئیمام "بەقی کوڕی موخلید"ە، کە گوایە **5374** ریوایەتی لە ئەبو هورەیرەوە هێناوە، ئەو فەرمودەکانی هەر هاوەڵێکی بە جودا هێناوەتەوە وەك ئەوەی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە موسنەدەکەیدا کردوویەتی، ئەویش لە موسنەدەکەیدا **3878** ریوایەتی هێناوەتەوە، بەڵام موسنەدی "بەقی" بزرە، تەنها یەك دانەی دەستنووس یان چاپکراوی نییە.

بەڵام ئەگەر گەڕانێك لەنێو هەر شەش کتێبەکەی فەرموودەدا بکەین، دەگەینە کە ئەو ئەنجامەی کە لە هەر شەشیان ئەو ژمارەیە هاتووە، واتە کۆکراوەی ریوایەتەکانی هەر شەس کتێب **5374** ریوایەتە، با بێین و شەن و کەوێك بۆ ئەو ژمارەیە بکەین و بە چەند فلتەرێکدا بیبەین :

سەرەتا دەبێ بزانین کە فەرموودە دووبارەکان لەو ژمارەیە"**4044**"ە، واتە تەنها **1300** دانەیان دەمێننەوە، فەرموودەی دووبارە ئەوەیە کە دوو تابیعی "یان زیاتر" هەمان ریوایەتیان لە ئەبو هورەیرەوە گێڕابێتەوە، واتە **4074** دانە لەو ژمارەیەی سەرەوە دووبارەن و دوو یان سێ و زیاتریش یەك ریوایەتیان لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاوەتەوە، کەواتە **1300** فەرموودە هەن لە هەر شەش کتێبەکە کە دەگەنەوە ئەبو هورەیرە.

پاشان ئەگەر بێین ئەو فەرموودانە لابدەین کە هاوەڵی دیکەش هەمان فەرموودەیان لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، واتە ئەو فەرموودانەی کە دوو هاوەڵ یان زیاتر لە خۆشەویستییان صلی الله علیه وسلم گێڕاوەتەوە، ئەگەر لەو ژمارەیە دەریان بکەین ژمارەیەکی زۆر بچوك دەمێنێتەوە کە لە پەنجەکانی دوو دەستی مرۆڤ تێپەڕ ناکەن!.

ئەگەر بچین و لە هەر نۆ کتێبەکەی سوننەت بگەڕێین دەبینین کە ژمارەی ئەو ریوایەتانەی پاڵدراونەتە لای ئەبو هورەیرە **8960** دانەن، **8510** یان بە سەنەدی بێ بچڕان هاتوون، و **450** دانەیان سەنەدەکانیان پچڕاوی تێدایە.

لێکۆڵینەوە دەری دەخا کە ژمارەی فەرموودەکان بێ دووبارە **1475** دانەن، ئەو فەرموودانەش کە هاوەڵی دیکە لەگەڵی ریوایەتیان نەکردووە و بەتەنها بەخۆی ریوایەتی کردوون، **250** دانەن، ئەوجار ئەگەر ئەو ریوایەتانە لابدەین کە دووبارەن و هاوەڵی دیکەش ریوایەتی کردوون، تەنها **42** دانە دەمێننەوە!.

راستی ئەوەی بیەوێ بگاتە راستی ئەو ژمارانەی سەرەوە لێڵی و نارِوونی نایەڵن و رۆشنی دەخەنە بەرچاومان.

لەو داتا و زانیارییانەی سەرەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە ئەو ژمارانەی کە بەمەبەستی تانە دان لە ئەبو هورەیرە دەهێنرێنەوە دوورن لە لێکۆڵینەوەی زانستی و بەرگەی تانەی بابەتی ناگرن و پوچەڵ دەبنەوە.

پاش ئەوەی ئەو داتایانەی سەرەومان بینی، دەبێ ئینکاری ئەوە نەکەین کە ئەبو هورەیرە ژمارەیەکی زۆری ریوایەتی لە خۆشەویستەوە "صلی الله علیه وسلم"ـەوە گێڕاوەتەوە، {بە بەراورد بە هاوەڵەکانی دیکە، نەك ئەوەی کە باس دەکرێ چەند هەزار ریوایەتی گێڕابێتەوە} زانایان ئینکاری ئەوەیان نەکردووە، بەڵام چەند هۆکارێك هەن بۆ ئەو ژمارانە :

یەکەم: ئەبو هورەیرە هیچ کارێکی نەبوو جگە لە خزمەتکردنی خۆشەویست صلی الله علیه وسلم، بەردەوام لەگەڵی بوو، یەکێك لە وهاوەڵانە بوو کە بە (اهل الصفه) ناسراو بوون، هەروەك خۆی دەڵێ بەوەی کە نانەسکی دەستکەوتبایە، لە خزمەتی پێغەمبەر بوو.

دووەم: ئەبو هورەیرە فەرموودەی لە هاوەڵە گەورەکان گێڕاوەتەوە، واتە لەوانەیە فەرموودەی لە ئیمام ئەبو بەکر بیستبێ، یان لەهەر هاوەڵێکی دیکەی بیستبێ و پاڵی دابێتە لای خۆشەویست صلی الله علیه وسلم.

سێیەم: گرینگرین هۆکار دوعای پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم بۆی، لە {بوخاری و موسلیم}دا هاتووە، بە چەند ڕێگایەك لە ئەبو هورەیرەوە گێردراوەتەوە کە دەڵێ : ڕۆژێك لە خزمەتی خۆشەویستدا صلى الله عليه وسلم دانیشتبووین، فەرمووی : "کێ لە ئێوە عەبایەکەی رادێخێت و تا من قسەکانم تەواو دەکەم هیچ شتێك لەبیر نەکات کە لەمنەوە گوێی لێ دەبێت"؟ ئەبو هورەیرە دەڵێ : عەبایەکەم رایەخست و خۆشەویست صلى الله عليه وسلم قسەکانی تەواو کرد، پاشان عەبایەکەم هەڵگرتەوە و هیچ شتێك کە لەوەوە بیستبم بیرم نەچۆتەوە.

ئەو ریوایەتە لە رووی سەنەدەوە هیچ کێشەیەکی نییە رشتەیەکی دروستی هەیە، کەسی وای تێدا نییە کە گومان لە ریوایەتی بکرێ، سێ چوار رشتەی هەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا، لە رووی مەتنیشەوە بێ کێشەیە، مەگەر یەکێك جورئەتی ئەوە بکات بڵێ دووعای خۆشەویست صلى الله عليه وسلم گیرا نەبووە؟!. ئەگەریش دەڵێن گیرا بووە، ئەوا سەت هەزار ریوایەتیشی کردبێ زۆر نییە.

چوارەم: زۆری ژمارەی قوتابییانی ئەبو هورەیرە هۆکارەکی دیکەیە بۆ بڵاو بوونەوەی ئەو ریوایەتانەی کە لە ڕێگای ئەوەوە گەیشتوونەتەوە خۆشەویست، ئەوەتا ئیمامی بوخاری دەڵێ : "بیرم لە قوتابییانی ئەبو هورەیرە کردەوە، (هەشتسەت) یانم بیر هاتنەوە"، هیچ هاوەڵێکی خۆشەویست نەبووە کە ئەوەندە قوتابییەی هەبێ.

پێنجەم: ئەگەر گریمانەیەك بکەین کە ئەبو هورەیرە رۆژانە تەنها پێنج ریوایەتی لە خۆشەویستەوە ریوایەت کردبێ، بە جۆرێك کە هەر جارێك بۆ نوێژێك خۆشەویستی بینیبێ، ریوایەتێکی گێرابێتەوە، کە زۆر نییە، رۆژانە پێنج جاران کە بۆ نوێژ هاتبێتە لای، لەماوەی سێ ساڵان دەکاتە هەزار و ئەوەندە رۆژە و کۆکراوەکەی دەکاتە زیاتر لە پێنج هەزار دانە، کە سەلماندمان ئەوەندەشی ریوایەت نەکردووە، هەندێك لەو ریوایەتانەشی لە هاوەڵە گەورەکان ریوایەت کردووە، زیاتر لە چوار ساڵیش لە خزمەت خۆشەویست ماوەتەوە نەك سێ ساڵ، هەروەك ئیبنو حەجەر لە (فتح الباري، **6/608**) ئاماژەی بۆ دەکا.

شەشەم: ئەبو هورەیرە پرسیاری لە خۆشەویست دەکرد، زۆر جاران هاوەڵەکانی دیکە شەرمیان دەکرد ئەوەندە پرسیار بکەن، بەڵام ئەم زیاتر پرسیاری دەکرد، لە "بوخاری"یدا هاتووە کە کاتێك پرسیارێکی لە خۆشەویت کردووە، خۆشەویست صلى الله عليه وسلم پێی فەرمووە : "دەمزانی جگە لە تۆ کەسی دیکە ئەو پرسیارەم لێ ناکا، لەبەر ئەوەی کە دەبینم چەند حەریسی لەسەر وەرگرتنی حەدیس"، هەروەك ئیمامی ئەحمەد لە "ئوبەی بن کەعب"یش دەگێڕێتەوە کە فەرمویتی : ئەبو هورەیرە پرسیاری شتی وای لە خۆشەویست صلى الله عليه وسلم دەکرد کە هاوەڵانی دیکە ئەو پرسیارەیان لێی نەدەکرد.

حەفتەم: ئەو یادگایەکی بەهێزی هەبوو، توانای لە لەبەر کردن بەهێز بوو، خەڵکی دیکەی وەك ئەو زۆر بوون لە سەردەمێك کە جارێ پێشکەوتنی نوسین وەدیار نەکەوتبوو، مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کە یۆنانەکان کاتێك نوسین پێشکەوت بەشێکیان پێیان ناخۆش بوو، دەیانگوت کە توانا و هێزی لەبەر کردن کەم دەکاتەوە.

هەشتەم: هۆکارێکی دیکە ئەوەیە کە زەیدی کوڕی سابیت بە رشتەیەکی "جید" دەیگێڕێتەوە {هەروەك ئیبنو حەجەر لە "الاصابە، **4/208**" دا وا دەڵێ} کە پیاوێك هاتوەتە لای زەیدی کوڕی سابیت و پرسیارێکی لێ کردووە، ئەویش وتویەتی برۆ پرسیارەکەت لە ئەبو هورەیرە بکە، لەبەر ئەوەی رۆژێك من و ئەبو هورەیرە و کەسێکی دیکە لە مزگەوت بووین، دوعا و زیکرمان دەکرد، خۆشەویست صلى الله عليه وسلم وەدیار کەوت و هات لەلای ئێمە دانیشت و فەرمووی : "بگەڕێنەوە سەر ئەو شتەی کە لەسەری بوون"، زەید دەڵێ : من و هاوەڵەکەم دووعامان کرد، خۆشەویست صلى الله عليه وسلم "ئامین"ی بۆ دوعاکانمان دەکرد، کاتێك ئەبو هورەیرە دوعای کرد، گوتی : خوایە من بەو جۆرە دوعات لێ دەکەم کە ئەو دوو هاوەڵەم دوعایان لێ کردی، هەروەها دوعای زانستێکیشت لێ دەکەم کە لەبیرم نەچێتەوە، خۆشەویست صلى الله عليه وسلم "ئامین"ـی فەرمووە، ئێمەش گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمەش داوای زانستێکت لێ دەکەین کە لەبیرمان نەچێتەوە، خۆشەویست فەرمووی "ئەو کوڕە دەوسییە لە پێش ئێوەی دایەوە".

نۆیەم: ئەبو هورەیرە رەزای خوای لەسەر بێ، بەردەوام ئەو ریوایەتانەی کە گوێی لێ بووبوون دەیگێڕانەوە، هەندێك هاوەڵان تەنها لەکاتی پرسیاری شەرعییان لێ دەکرا ئەوکات فەرموودەیان دەهێناوە، ئەو بەمەبەستی ئەوەی خەڵکی فێر بکات فەرموودەی دەگێڕانەوە. دوای زانینی ئەو هۆکارانە و زانینی ژمارەی ئەو فەرموودانەی کە ئەبو هورەیرە لە خۆشەویستەوە گێراوییەتیەوە، نەفامی و نا ئاقڵی یە






مەرجەکانی بڵاو بوونەوەی بابەت لەم گۆڤارە:

-1 بابەتکە نوێ بێ و لە شوێنی دیکە بڵاونەبووبێتەوە.

-2 بابەتەکان لە 2000 وشە تێنەپەڕن، گۆڤار بۆی هەیە بابەتی درێژ کورت بکاتەوە.

-3 ئەو نووسەرەی کە یەکەم جارە بابەت دەنێرێ، باشترە چەند دێڕێك لە ژیاننامەی خۆی بنێرێ.

-4 هەموو بابەتەکان دەکەونە بەر دیدی دەستەی نووسەران و ئەگەر لەگەڵ بنەما سەرەکییەکانی گۆڤار نەگونجان، بۆی هەیە رەتی بکاتەوە، یان داوا لە نووسەر بکا کە دەستکاری بکا.

-5 گۆڤار ئەگەر بابەتێکێکی قەبووڵ کرد بۆ بڵاوکردنەوە، ئاگاداری نووسەرەکەی دەکاتەوە، بەڵام لەکاتێکدا بڵاونەبوویەوە، پەیوەست نین بە ئاشکرا کردنی هۆکاری بڵاونەبوونەوەی.

-6 بابەتە بڵاوکراوەکان دەبنە موڵکی گۆڤار و هەر کاتێك بیەوێ بڵاوی دەکاتەوە، لە هەر توێژینەوە و پەڕتووکێکیش پێی گونجاو بێ، بە زمانی خۆی یان وەرگێڕدراو بۆ هەر زمانێکی دیکە بڵاوی دەکاتەوە.

تکایە بابەتەکان تەنها بۆ ئەم ئیمەیلەی خوارەوە بنێرن:

Govari.raha@gmail.com

